

دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی

# چۆن حەج دەکەی



دانانی
شێخ محمد شێخ طه بالیسانی



کۆماری عیراق
وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن
دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی ژمارە (٢٩٧)


# چۆن حەج دەکەی


دانانی
شێخ محمد شێخ طه ئالیمانی

ئـــەم نامەیـــە نامەیێکـــە بـاسی چۆنیـــەتی حـــەج و عـومـــرەی

تیـادا نووســـراوە .لــە ســـەر چـــوار ڕێبـــازو لـــە گـــەڵ

بڕیـــاری ( ابن الحـــزم )وە هەمـــوو کـــردەوەیێکـــی

حـــەج و عومـــرەی تێـــدا ڕۆن کـــراوەتـــەوە

بە جـــۆرێکـــی زۆر ئاشکـــراو سـانـا وە

پێشـــکەش بـــە بـرا موســـوڵمانـەکـانـی

کـــوردی ئەکـــەم ســـوودی لـــێ

وەر بگـــرن وە دوعـــای

خێـــرم بـــۆ بکـــەن وە

خـــوا پاداشـــم

بـــدات ئامـــین

# « به ناوی خودای بەخشندەو میهرەبان »

سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە قورئانی بۆ ئێمە ناردووە بـۆ ڕێگـە ڕۆنی ژیان ،وە درودو چاکەی زۆر بڕژێن بە سەر حەزرەتی (محمـد)دا کە شارەزای کردین بۆ باشترین ڕێگەو جوان ترین ڕەووشت ،وە بە سـەر کەسو کاری وە دۆستو یاری ،وە هەر کەس کە پەیرەوی ئایینی ئـەو بکات ،تا ڕۆژی قازانجو زیان . لە دوای ئەمە لە سالی ١٩٧٧ دا ،یەکێك لە برادەرانی عەرەب داوای لێ کردم کە چەند لاپەڕەییکی بۆ بنووسم وە چونیەتی حەج کردنی بۆ تێدا ڕۆن بکەمەوە بەلکە خوا چوونە حەجی بـۆ ڕێك ئەخات وە ئەم نامەیە ئەکاتە ڕێ‌ڕۆنو بە پێی ئـەو حـەج ئەکـات .

جا لە بەر ئەوەی کە خوا ئەفەرموێت (فأمّا السائل فلا تنـهر ) واتـە ئەوەی داوای زانینت لێ ئەکات دڵ کزی مەکە وە بە خۆشی وەلامی بدەوە هەلسام دەستم بە نووسین کرد وە باسی حەجو عـومرەم لە سـەر پێنـج ڕێباز تێدا نوسی . واتە ڕێبازی شافعـیو حەنەفـیو مالکـیو حەنبـەلیو ابن الحزم ،وە خوا بۆی ڕێك خستم هەر لەو سالـە دا لە چـاپ درا ،وە پێنج هەزار نوسخەم دەرکرد . وە خەلك زۆر پەسندی کرد ،بەجۆرێکی وا ئیستا لەو پێنج هەزارە بەس نزیکی سێ دانەی ماوە گشتی فرۆشـا وە خەلك سوودیان لێ وەرگرت .

وە ئومێدم وایە کە خوا یاداشی منیشی نووسیبێ لە دەفتەری چاکـەم هەر چەندە من زۆر بێ کەلكو کردەوەی چاکەم بەلام خوا زور کەریمە وە

بەرامبەر بەندەکانی غەفورو رەحیمە وە بە گوێرەی حەدیثی پیرۆز ( الاقربون أولی بالمعروف ) واتە ئەوەی خزمتە شایاتترە بۆ چاکە لە گەل کردنی • ویستم هەر وەك چاکەم لە گەڵ برا عەرەبەکان کرد وە ئەم نامەیەم پێش کەش کردن بە ناوی ( کیف تحج ، وکیف تعتمر )ئاورێکیش بە لای برا کوردەکان بدەمەوە ، وە نامەکەیان بۆ وەر بگێرمە سەر زۆبانی کوردی

جا لە رۆژی پێنج شەمەی رێکەوتی ٢٣/رجب/١٤٠٣ك•وە نە٥/٥/١٩٨٣ز دەستم کرد بە وەرگێرانی • وە نلوم نا (چۆن حەج ئەکەی وە چۆن عومرە ئەکەی ) •

وە بەندە محمدم کوری شێخ طاهای بالیسانی خوا لە منو دایكو باوکمو گشت موسولمانان خۆش بیت وە چاکە لە دونیاو قیامەت لە گەڵ هەمووومان بکات وە بمانخاتە سەر رێگەی راست • وە دوورمان خات لە گشت بەلاوو وێلو سەر گەردانی _ آمین _

**محمد شێخ طاها بالیسانی**

## بـۆ ئاگاداری

له پێش هەموو شتێك دا پێشەكی‌یەكم نووسی هەندێ شتم تێــدا ڕوون كردەوه كه سوودێكی زۆر ئەبەخشێت بۆ خوێنــەر پاشان باسێكــم نووسی كردەوەكانی حەج‌و عومرەم تێدا ڕوون كردەوه • لەو كاتە كه پیاو حەج دائەبەستێ‌و دەستی پێ ئەكات تا كو كۆتایی پێ دێنێ •

پاشان باسی دووەمم نووسی كردەوەكانی حەجم یەكه یەكه تێدا باس كرد ەوه ئەوەی پەیوەندی بەو كردەوەوه هەیه به پێی ڕێبازی هەر پێنج پێشەوا رەزای خوایان لێ بێت وه له ئیمەش بێت • نوسی جا بۆیه له سەر پێنج ڕێبازم باس كردتا كو ئـەو چەنـد ســووده بۆ خوێنـەوار بـدات • یەكەم : ئەوەیه كه حاجی له بڕیاری سەخت‌و بڕیاری ئاسان ئاگادار ببێت ، بۆ ئەوەی به كەیفی خۆی بێت به كامی ئیش ئەكات له كاتی تەنگانــەدا بەلام له كاتی فراوانی‌داوا باشه بۆ مرۆ كام ڕێگە له سەر هەموو ڕێبازێـك گیرایەو دروسته بەم ڕێگه ئیش بكات • وه ئەگەر بۆی نەكرا كام ڕێگــه ئاسانه با بەو ڕێگه ئیش بكات‌و خوا رەحمەتی بۆ بەنده ناوێت ەوه مـرۆ لەم پێنج ڕێگه بەكامی ئیش بكات پسیاری لێ ناكرێـت وه كـەس حەقـی رەخنەی لێ نیه ، مەگەر یەكێكی نەزان‌و بێ ئاگاداری له ئـایین ئـەویش گووێ پێ نەدراوو قسه وەر نەگیراوه •

دووەم بۆ ئەوەی هەر كەس ڕێگەو بڕیاری پێشەوای خۆی بزانێت واته موسولمانی شافیعی هی ئیمامی شافیعی بزانێت‌و ، حەنەفی هی ئیمامی حەنەفی بزانێت‌و ، هەر وەها به گوێرەی ڕێبازەكانی تره چونكو له وانەیه

هەندێ کەس حەز نەکەن لە ڕێگەی پێشەوای خۆیانو لە ڕێبازی خۆیان لا بدەن ٠

سێیەم : زۆر جار ئەبێت حاجی کردەوەیێك لە کردەوەکانی حەج نا کات جا لە بەر هەر هۆیەك بێت وە کاتی کردەوەکەش نامینی ٠جا ئەگەر مرۆ ئاگادار بێت لە بڕیارانی پێشەوایان ئەتوانێ تەقلیدی ئەو پێشەوایە بکات کە لای وایە دروستە ئەو کردەوەیە نە کرێت ،وە بەم تەقلیدە لە زەحمەتو دڵ لەدڵدان دەر ئەچێت٠ وە تەقلیدیش پاش کردەوە دروستە ٠

پاشان کۆتاییەکم نووسی باسی چۆنیەتی چوونە مەدینەی مونەووەڕەو چۆنیەنی زیارەتی مەرقەدی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت وە ئەو شتانەی کە لە مەدینە ئەکرێن لەم کۆتاییەمدا ڕوون کردەوە ٠ پاشان باسی سێیەمم نووسی بۆ باسی عومرە ٠ وە بە مە کوتاییم بە نامەکەم هینا ٠

**پێشەکی**

لەم پێشەکییە دوو باس ئەکەین ٠ لە باسی یەکەم دا ئەمە ڕوون ئەکەینەوە کە حەجو عومرە واجبن ٠ وە لە باسی دووەم دا مانای چەند وشەیەك ڕوون ئەکەینەوە کە زۆر لە باسی حەج دا باس ئەکرێن ٠

**( باسی یەکەم )**

(ئایا حەج واجبە وە بە چ مەرج واجبە )

حەج واجبە لە سەر هەموو موسولمانێك چ پیاو چ ژن ،وەلە ماوەی ژیاندا یەك کەڕەت واجبەو بەس جالەسەر هەموو ڕێبازێك وایە ٠

( مەرجی حەج واجب بوون)

بە چوار مەرج حەج لەسەر موسولمان واجب ئەبێت ٠

یەکەم : ئەوەیە موسولمانەکە پێ گەیشتوو بێت ٠ کەوابێ مناڵ حەجی لەسەر واجب نیە تاکو پێ ئەگات ، واتە شەیتانی پێ بکەێت یاخۆ تەمەنی بگاتە پانزە سالی تەواو ٠

بەلام ئەگەر حەجی کرد یاخۆ یەکێك حەجی پێ کرد حەجەکەی دروستە ، هەرچەند بەر حەجی فەرز ناکەوێت • واتە ئەگەر گەورە بووو نواناى بۆ ئەبێ حەج بکاتەوە •

دووەم : ئەبێ ژیردار بێت ، کەوابێ شێت حەجی لەسەر ینە تاکو چاك ئەبێت • وە ئەگەر لە کاتی شێتی حەجی کرد پاحەجی پێ کرا حەجەکەی دروست ینە •

سێیەم : ئەوەیە گە مرۆڤ ساغ بێت لەو نە خۆشیانەی کە پەکی ئەخەن لە سەفەر گردن • کەوابێت نەخۆشێکی وا کە تواناى سەفەری نیە حەجی لەسەر نیە تاکو چاك ئەبێتەوە • وە ئەگەر ئومێدی چاك بونی نەبوو ، وەك پیری تەلفاو وەیا شەپرە لێدراو یاخۆ دەردێکی وای هەبو ئومێدی چاك بونی نائکرا • جا ئەو جۆرە کەسە بە ( پەك کەوتو )ناو ئەبرێت •

## ( باسی پەك کەوتو )

پەككەوتو لەلای سێ پیشەوا لەسەری فەرزە یەكێك بنیرێت بۆ حەج تاکو حەجی لە جیاتی بکات جا ئەو کەسە بەکرێ بیت یا بە بەلاش • بەلام لە رێبازی مالك پەكئەوتو لە سەری نیە کەس بنیرێت بو حەج بەلام ئەگەر چاك بو واجبە حەج بکات ئەگەر نا هیچ شتیکي لە سەر نیە

وەلیرەدا ئەو پرسیارە ئەکرێت !

(١) ئەگەر پەك کەوتو یەکیکی نارد وەحەجی لە جیاتی کرد پاشان خوا رەحمی کرد چاك بو ئایا لە سەریە دوبارە خۆی بچیت بۆ حەج یانەنا ؟

وەلام لە لای حەنبەلی لە سەری نیە نو بکاتەوە وە لە لای شافیعیو حەنەفی لە سەریەتی حەجەکە نۆ بکاتەوە وەزانیت کە لە لای مالك حەج لە جیاتی کردنی نیە تاکو نۆ بکاتەوە یا نەکاتەوە •

وە ئەگەر نەخوشەکە ئومیدی چاك بونەوەی هەبو بۆی دورست نیە کە خەلك لە جیاتی خۆی بنێرێت حەجی بۆ بکات • وە ئەگەر ناردی حەجەکە دورست نیە وەگیرا نابیت با بەنەخوشیەکەشی بمرێت جا ئەوە لای شافیعی وحەنبەلی وایە بەلام لە لای حەنەفی ئەگەر مرد بوی دروستە وەنایەویت حەجێکی تری بو بکرێت وە ئەگەر چاك بو دروست نیە ئەبی خۆی حەجەکە بکاتەوە •

چوارەمین مەرج بۆ واجب بونی حەج ئەوەیە کە توانای مالی هەبیت وەخەرجی چونو هاتنەوەی هەبیت وەئەو خەرجیە زێدەبیت لەو شتانە : قەرز (٢) خانو (٣) هەرچی کە پێویستی مالە (٤) هەرچی پێویستی خۆیەتی وەك کتیبو خزمەت چی (٥) هەم زێدە بیت لە خەرجی ئەوکەسانەی کەخەرجیان لەسەر ئەوە وەك مالو منال وە خزمی هەژاری وە لە خەرجی ژن هینان بۆ خۆی یا باوکی یا منالی ئەگەر ترسی زینای هەبێت • وە بۆ ژن ئەبی ئەو مەرجانەی لێ بێتە دیٚ وەمەرجی تریشی ئەبی هەبی ئەویش ئەوەنە کە بتوانی مەحرەمێك لە گەل خۆی ببات بە کرێ یان بە بەلاش •

جا ئەگەر ئەو توانایەی نەبو حەجی لە سەر نیە لە لای حەنبەلیو حەنەفی وە لەلای شافعیو مالکی ئەگەر مەحرەم نەبو بەلام کومەلە ژنێکی روا پێ کراو هەبون کە لە چونو هاتنەوە لە گەلیان بێت بێ جیا بونەوە لەم حالەش لە سەری واجبە وە ئەبی مرو خەرجی لەمەش زێدە بیت کە بو پیشەی خۆی پێویستی پێ هەیە بە جورێك کە هاتەوە پیشەکەی ماتەل نەبێت •

« ئاگاداریێك »

یەکێك حەجی لە سەر واجب بو لە لای حەنبەلیو مالکیو حەنەفی ئەبێ جێ بە جێ بچیت لە یەکەم سالدا وە ئەگەر دوای خست گوناهبارە •

بەلام لە لای شافعی دورستە دوای بخات وە گوناهبار نیە تاکو ئاخیر سال •

وە هەر کەسێك حەجی لە سەر بو وەنە بە خۆی نە بە یەکێکی تر حەجی نە کرد تا کو مرد • ئەمە لە لای شافعیو حەنبەلی لە سەر میراتگرانی واجبە حەجی بو بکەن وە خەرجی حەج لە مالەکەی دەر ئەکرێت • وە خەرجی حەج پێش قەرزی خەلك ئەخرێت واتە ئەگەر مالەکەی بەشی قەرزو حەجی نە کرد حەجەکە ئەکرێت وەقەرز بە جێ ئەهێشترێت جا وەسیەتی پێ کردبێت یانە نا • بەلام لە لای مالکیو حەنەفی لە سەریان نیە حەجی بو بکەن بەلام ئەگەروەسیەتی پی کردبو حەجەکەی لە سێیەکی مالی بو ئەکرێت نەك لە هەمو مالەکەی •

**باسی دووەم**

**لەواتەی چەند وشەیێکە کە زۆر لە حەجدا باس ئەکرێت :ـ**

١ ـ ئیحرام ئیحرام بە مانا چونە ناو حەج یان چونە ناو عومرەیە • واتە نیەتی حەج دابەیتن یا عومرە دابەستنە وە ئەونیەتەش بە دلە نەك بە زوبان • بەلام ئەگەر بە زوبانیش بلێت باشترە •

تێ بینی :ـ

زور کەس واتێ ئەگات کە ئیحرام بریتیە لە جل داکەندن وە پەشتەمال لە خو لول دان • جا ئەوە هەلەیە چونکو ئیحرام نیەت هێنانی حەجە یا نیەت هینانی عومرەیە • وە جل لە بەر کردنو پەشتەمال لولدان ئەبێ پێش ئەو نیەتە بن چونکو لە کاتی نیەت نابی جلی لە بەر بێت • هەر وەك لە کاتی نیەتی نوێژ تابیێدەست نوێژبێت •

**دووەم وشەی تەلبیە**

تەلبیە ئەوەیە حاجی کە نیەتی حەجی هینا ئەلیت : « لبیك اللهم لبيك • لبيك لاشريك لك لبيك • انّ الحمد والنعمة لك والملك لاشريك لك » وە بە کوردی بەم جورەیە •

لــه دوای فــەرمـانـــت هـاتـــم
خــوایــه بــەدوای فـــەرمـانـت
هـاتـــم دو بــــاره هــاتـــم
لـــه دوای ئـــەمرو فـەرمـــانـت
تــو هیـــچ هـــاو بـــەشـــت نیـــه
هـاتـــم لـــه دوای فـەرمـــانـت
ســـوپــــاس وچـــاکـــه گشـــتی
هــی تویـــه گشـــت ســـامـانـت
هــی تویـــه بـــێ هـــاو بەشـــی
لـــه شـــایـــەتـــی وســـامـانـت

۳ ـ بەیت ، بەیت واته کەعبه بەو ئودەیه ئەڵێن که حەزرەتی ئیبراهیـــم دروستی کردیه وه کەوتوته ناوەندی مزگەوتی حەرام •

٤ ـ المسجد الحرام • واته مزگەوتی بەرێزبەو مزگەوته ئەڵێن که دەورەی له کەعبه داوه لەمەککـه •

٥ ـ طواف تەواف به سوڕان له دەورەی کەعبه ئەوترێت •

٦ ـ سعی ـ سەعی به مانا هاتو چونه له بەینی جێگەیەك که ناوی سەفایـه وەجیگەیێکی تر که ناوی مەڕوەیه •

۷ ـ شوط :ـ شەوت ئەگەر بو تەواف گوترا واته یەك سور خواردن لـه دەوری کەعبه • وه ئەگەر بو سەعی ووترا واته یەك جار چـون لـه سەفاوه بو مەروه جائەمه شەوتێکه ، وه هاتنەوه له مەروه بو ســەفا شەوتێکی تره جا ئەوه بریاری هەر پێنج پیشەوایه • رمزای خوایان لێ بێتو ولەئێمەش بیت ( آمین ) •

٨ - ( وقوف ) به مانا ئاماده بونه له كێوى عەرەفات •

٩ - ( افاضه ) به مانا گەرانەوەیه له عەرەفات •

١٠- ( مبیت ) به مانا شەو كردنەوەیه له موزدەلیفه یا له مینا •

١١- ( نفر ) به مانا بەچى هێشتنى مینایه له رۆژى سێیەمى جیژنه یا چوارەم

١٢- ( روكن فەرض شەرط ) ئەنجامى هەر سێكیان یەكه واته بەكردەوەیێك ئەلێن ئەگەر نەگرێت حەج بەتال ئەبێت وه بەفدیەو خوێـن جـەب ناكرێتەوه •

١٣- ( واجب ) به كردەوێك ئەلێن ئەگەر نەكرا حەج بەتال نیه وه به فیدیه جەب ئەكرێتەوه وه گوناهیش له تـەركى نیه ئەگـەر به هوێـك یا عوزرێك بێت • بەلام بێ هوو عوزر ئەوەى نایكات گوناهباره هەر چەنده به فیدیەش جەیى بكاتەوه •

١٤- ( سونەت ) به كردەوەیێك ئەلێن ئەگەر نەكرا نه گوناه ئەبەخشیتو نەحەج بەتال ئەكات وه نه فیدیەشى ئەوێت •
بەلام مرۆ له خێرى ئەم كردەوەیه بێبەش ئەبێت •

١٥- ( تحلل ) به مانا دەرچونه له حەج یان له عومره وه دوو دەرچون له حەج هەیه بەیەكەمى هەندێ شت حەلال ئەبێت وەبـه دووەمى هەمـو شت حەلال ئەبێت وه ئەوباسه پاشان دێت •

١٦- ( رجم - رمى ) ئەم دوو وشەیه هەردوكیـان به یـەك مانـان واتـه بـەرد فرێـدان •

واته سێ جێگه هەیه له مینا حاجى ئەبێ بەرد بگرێته ئەو جێگانه • وه بەم جێگانه ئەلێن ( عقبـه ) واتەكوسـپه • واته بـەرزى جا ئـەو • بەرزیانه یەكەمیان كه بچوكى پێ ئەلێن له لاى مزگـەوتى خێفـه وه ناوەنجى له بەینى بچوكو گەورەیه وەهى گەوره لـه ئاخیرەوەیـه •

١٧- ( دم ، فيديه ، كفاره ) ئەوسێ ووشەیە هەرسێك بە مانایێكن وە بەو شتە ئەڵێن کە ئەکەوێتە سەر حاجی بە هۆی نەکردنی واجبیك یا کردنی شتێکی قەدەغە کراو •

جا دوو جورە فیدیە هەنە •

یەکەمی ئەوەیە ئەبی حەیوانێك بکوژیتەوە ئەگەر ئەوەت بۆ نەکرا دە روژو ئەگرێت سێیان لە حەج وە حەوتیان لە مالەوە جابەمەئەڵێن فیدیەی پە ڕێزەواتەئەوەیدووافاکرێ تا لە وەی پیشو پێ دەستەلات نەبی دووەمی فیدیەی خودموختاری • ئەویش ئەوەیە یاخو حەیوانیك سەر ئەبریت یاخو شەش هەژار تێر ئەکەی نیوەروو ئیوارە یا خو سی رۆژی ئەگریت لەم سێیە کامی ئەکەیت کەیفی خۆتە •

١٩- ( میقات ) بە دو شت ئەڵێن یەکەم بەو کاتە ئەڵێن کە دروستە حەجی تێدا دابەستی دووەم بەم جێگە ئەڵێن کە لەوێ دەست بە حەج ئەکرێت و ئیحرامی لێ دائەبەسترێت • جا ئەو پیشەکییە • باش وەربگرە چونکو پر سودە وە لە باسەکانی تر پێویستت پێ ئەبیت وەئومید وایە کە نامەکەم بە باشی تەواو بکەم بە یارمەتی خودای مەزن •

## باسی یەکەم

لە باسی یەکەم دا چەند لقێك ئەنوسین وە لەم لقانەدا باسی ( میقاتی ) جێگەیی و میقاتی کاتی ئەکەین وە باسی چونیەتی حەج ئەکەین لە کاتی دەست پێ کردنی لە میقاتەوە تاکو حەجەکە تەواو ئەبێت وەباسی حوکمی کردەوەکان ئەکەین •

لقی یەکەم لە باسی میقاتی کاتی (زەمانی) کاتی حەج دابەستن لە رۆژی یەکەمی مانگی شەووال دەست پێ ئەکات • وە بە هەلاتنی بەیانی روژی

جێژنەی قوربان کوتایی دێت • جا لەو ماوە دا هەر کات ئیحرام بە حەج ئەبەستی دروستە وە ئەگەر کەسێك پێش ئەو کاتە ئیحرامی بەحەج دابەست لای شافعی ئەمە دروست نیە وەدانامەزرێت بەلکو ئەبی بیکات بە عومرە وەعومرە بکات • وە بە مە لە ئیحرام دەر ئەچیت • وە ئەو عومرەش • بەر عومرەی واجب ئەکەوێت • بەلام لە لای حەنەفی ومالکیو حەنبەلی ئیحرامەکەی بۆ حەج دائەمەزرێت جا ئەبی لەو ئیحرامە بمێنی تا کو حەج تەواو ئەکات بەلام ئەڵێن ئەوە نا پەسندە ( مەکروە ) چونکو ئەبێ لەو ئیحرامە بمێنی تا کو حەج تەواو ئەکات وە ئەوە ماوەییکی زۆرەو زەحمەتە وە لە وانەیە خۆی پێ نە گیرێتو توشی شتێکی دژی ئیحرام ببێت •

بۆ عومرە هەمو دەم وەهەمو روزێك وە لە هەمو مانگێك دروستە ئیحرام بە عومرە ببەستی وە عومرە بکەیت • بەس بۆ حاجی دروست نیە تاکو لە هەمو واجباتی حەج ئەبیتەوە ئیحرام بە عومرە دابەستێ چونکو عومرە هینانە سەر حەج دروست نیە بەلام حەج هینانە سەر عومرە دروستە وەئەگەر کەسێك لە حەج دانەبو • لە رۆژی پێش عالفەی جێژنی قوربانەوە تاکو ئاخیر رۆژی جێژنە بەلای حەنەفی دروستنیە ئیحرام بە عومرە دابەستن وەلە لای سێ پیشەواکانی تر قەیدی نیە • مادام لە حەج دانیە •

باسی میقاتی • جێگەیی ( مکانی ) جا ئەو لقە چەندپەلی تێدایە •

یەکەم : میقاتی خەلکی (مەککە) بۆدانیشتوانی شاری مەککە جێگەی ئیحرام دابەستنیان بە حەج مالی خۆیانە هەرکەس لە مالی خۆی ئیحرام بۆحەج ئەبەستێ وە ئەچیت بۆ عەرەفات • بەلام بۆ عومرە ئەبێ لە سنوری حەرەم بچنە دەرەوە • وەلەوێ ئیحرام بە عومرە ببەستن ئەوجا بگەرێنەوە عومرە تەواو بکەن • وە زۆر جێگە هەنە لە دەرەوەی حەرەم

بۆ ئیحرام بە عومرە دابەستن بەلام لە هەمویان بە خێرتر مزگەوتی حەزرەتی عائیشەیە رەزای خوای لێ بێت •

( میقاتی ئەوانەی لە وولاتان ئەچن بۆ حەج و عومرە ) میقاتی ئەو کەسانەی لە وولاتان ئەچن بۆ حەج یان عومرە ئەوجێگانەن کە پێغەمبەر درودي خودای لە سەر بێت دیاری کردونە کە هەر کەس بەو جێگەدا بروات لەوێ ئیحرام دابەستێت جا ئەو جێگانە لە رێگەی مەدینەوە ذو الحلفەیە • وە ئیستا بە ئابارى عەلی ناو ئەبرێت وە ٤٦٤کم لە مەککە دورە • وە رێگەی شام ( جەحفەیە ) کە ئیستا پێی ئەلێن رابغ وە ٢٤٠کم لە مەککە دورە وەلە رێگەی نەجد ( قرن المنازل ) وە ئیستا بە وادی (محرم) ناو ئەبرێت • کە لە طائیف دەر ئەچیت بۆ مەککە لە سەر رێگایە وە ـ ٩٤کم لە مەککە دورە • وەلە رێگەی یەمەن ( یلملم ) وە ٥٤کم دورە لە مەککە وەلە رێگەی عراق ( ذات العرق )ە وە ٩٤کم لە مەککە دورە • جا ئەمە میقاتی دیار کراون بۆ ئەوکەسانەی لە وولاتان ئەچن بۆ مەککە بۆ حەج یان بۆ عومرە • جا هەر کەسێك بۆ حەج یا بۆ عومرە بچیت وە بە یەك لەم جێگانە دا تیپەرێت واجبە لە وێوە ئیحرام ببەستێت وە ئەگەر بە هیچ جێگەیێك لەو جێگانەدا تی نەپەڕیت ئەبێ لەو جێگەی کە لە راستی یەکێك لەو جیگایانەیە ئیحرام ببەستێت • وە ئەگەر بەراستی هیچیان دا نە رویشت یا خۆ نەیزانی کام جێگە راستی کامەیە ئەمە لە جێگەیێك ئیحرام ئەبەستێت کە ٨٠کم لە مەککە دور بێت • وە ئەگەر بەرێگەیێك دا رویشت کە ئەکەوێتە راستی دو میقات لە کامی ئیحرام دائەبەستی ؟ لێرەدا لە راستی میقاتی دور تر لە مەککە دائەبەستێت وە ئەوکەسانەی کە لە بەینی یەك لەو میقاتانەو مەککە دائەنیشن لە مالی خویانەوە ئیحرام ئەبەستن •

**پــەلی دووەم**

ئیحرام دابەستن پیشی گەیشتنــە میقات لــە رێبــازی حــەنــەفــی دا پەسندە • وە لە لای مالکیو حەنبەلی ناپەسندە وەلە لای شافعی دروستە بەلام لە میقات باشترە •

**پەلی سیەم :ــ**

باسی ئەو کەسەیە کەبەدوو میقاتــدا تێ ئەپەرێــت یا بــە راســتی دوو میقاتدا تێ ئەپەرێت •

یا بە میقاتێك وراستی میقابێکی تر تێ ئەپەرێت یا بەپێچەوانە •

لە لای حەنەفی دروستە لە میقاتێك بۆ میقاتێکی تر ئیحرام دووا بخەیت بەلام لە هی یەکەم خێر ترە بەلام لە میقات بۆ جێگایێك کە راستی میقاتە دروست نیە ئیحرام دووا بخەیت • وە لە راستی میقاتێك بۆ مێقـات دروستە ئیحرام دووا بخەیت •

وە لە لای مالکی لە میقات بۆ میقاتو بۆ راستی میقات دروستە بــە مەرجی میقاتی دوایی میقاتی وولاتی خۆی بێت وەراســتی دووایی راســتی میقاتی خۆی بێت ئەگەر نا دروست نیە • بۆ وینــە شامــی یان میــــری کە بە ( ذوالحلیفە )دا تێ ئەپــەریت دروسۆتە بۆیــان ئیحــرام دوابخــەن بۆ جەحفە یا خۆ بو راستی جەحفە چونکو هی خۆیانە بەلام مەدینەیی کــە بــە ذو الحلیفە دا چۆ بۆی نیە ئیحرام دوا بخات بۆ جەحفە وە یان بۆراستی جەحفە چونکو جەحفە میقاتی شارەکەی خۆیان نیــە وە ئــەگــەر دوای خست خوێنێکی لە سەرە بەلام ئەگەر بگەرێتەوە یەکەم میقات وە لە وێ ئیحرام نو بکاتەوە خوینە کــەی لە ســەر لائەکــەویت بــە مەرجێـك هیچ کردەوەی حەجی نەکردبێت •

وەلای حەنبەلیو شافعی دواخستن دروست نیە بە هیج جۆرێك •

پەڵی چوارەم :ــ

کەسێك کە بۆ حەج یان عومرە ئەچێت کە گەیشتە میقات واجبــە لە میقات ئیحرام ببەستێ وەئەگەر بێ ئیحرام بە ستێ لە میقات تێ پەربــو گوناهبار ئەبێت • وە خوێنیشی ئەکەوێتە سەر •• مەگەر پێش ئیحرام بەستن بگەڕێتەوە میقات وەلەوێ ئیحرام ببەستێ • یاخو کــە ئیحرامــی بــەست پێش کردنی هیچ کردەوەیێکی حەج بگەڕێتەوە میقات وەلەوێ ئیحرامەکەی نو بکاتەوە • وەئەگەر ئیحرامی بەست وەیەك کردەوەی لە کردوەکانی حەج کرد بۆ میقاتیش بگەڕێتەوە خوێنەکەی لەسەر لاناچیــت • جا ئەمــە بوزانا ونەزان ولە بیر کردەو وبەقە ستی کردە وایــە بەلام نەزانــو لە بیــر کردە گوناە بار نابن وە ئەوانیتر گوناهیشیان ئەکاتێ •

جا ئەوە بریاری شافیعیە • وەلای حەنەفی ئەگەر پێش ئیحـــرام بەستن گەراوە بۆ میقات خوێنە کەلا ئەچێت • وئەگەر پاش ئیحرام بەستن وپێش کردنی هیچ کردەوەیێکی حەج گــەراوە بــۆ میقــات لای ئیمـــام لائەچێت • بەمەرجێ لە میقات ( لبیك )ەبلێت • وەلــەلای محمــد وأبــو یوسف ( لبیك )ە بلێت یانەلێت لا ئەچێت • وەلەلای زوفەر لاناچێت تەلبیە بکات • یانەکات • وە لە لای هەمویان ئەگەر پاش کردنی یەك کــردەوەی حەج گە رایەوە لا ناچێت تەلبیە بکات یا نەکات • وەلەلای مالکی وحەنبەلی ئەگەر پێش ئیحرام بەستن گەراوە لائەچێت بــەلام پاش ئیحــرام بە هیــچ جورێــك لاناچێــت •

وەئەگەر کەسێك نە بۆ حەج نەبۆ عومرە ئەچو وە بە میقاتدا تێپەری ئەگەر ئەوکەسە بۆمەککــە ناچێــت ئــەوە هیچــی لە ســەر نیــە وە ئــەو کەسە پاش دەرچون لە میقات لە چ جێگا هاتە دڵی کە بۆحەج یان عومــرە بچێت با لەو جێگەدا ئیحرام ببەستێت وە ئەگەر بۆ حەجو عومرە ناچـــو بەلام بۆ مەککە ئەچو وە بە میقات دا چو ئەگەر هاتو چونی زۆرە لە بەینی جێگەکەو مەککە ئەوە لە لای حەنبەلیو مالکیو شافعــی لە ســەری نیــە

ئیحرام ببەستێ بەڵام لە لای حەنەفی ئەوەی لە بەینی میقات‌و مەککەیە لە سەری نیە وە ئەوەی لە پێش میقاتە لە سەریە ئیحرام ببەستێ • وە ئەگەر هاتو چۆنی زورنیە لە هەر جێگەیێك بێت کە ئەچێت بو مەککە دروست نیە بێ ئیحرام بچێت بۆ مەککە لە لای حەنبەلی‌و حەنەفی‌و هەندێ شافعی •وە ئەگەر نەیبەست خوێنی لە سەرە •وە لە لای مالیکیش واجبە ئیحرام ببەستێ بەڵام ئەگەر نەیبەست خوێنی لە سەر نیە جگە لەو کەسەی کە بۆ حەج یان عومرە ئەچێت وە باقی زانایانی تر ئەڵێن ئیحرامی لە سەر نیە مادام بو حەج یان عومرە نەچێت هەر چەند بچی‌و بێت • وە هاتو چونی زۆر بیت یا کەم •

## « پوختـــەی قســـە »

مرۆ کە بۆ حەج یا عومرە چو وە گەیشتە میقات وە ئیحرامی نەبەست ئەمە چەند حالی بۆ هەیە یەکەم بویێ نابەستێت چونکو ئەیەوێت لە میقاتی دووەم ببەستێت •جا ئەوە بەلای حەنەفی دروستە بە بێ مەرج وە لە لای شافعی‌و حەنبەلی دروست نیە بە هیچ مەرج وە لە لای مالکی دروستە بە مەرجێك کە میقاتەکەی دووەم میقاتی شارەکەی خۆی بێت‌وەك شامی کە بە مەدینە دا ئەروات وە ئەگاتە بیری عەلی کە میقاتی رێگەی مەدینەیە جا ئیحرامی خۆی دوا ئەخات بو جەحفە کە میقاتی خەلکی شامە وە بەبێ ئەو مەرجە دروست نیە •

دووەم حال ئەوەیە ئیحرام دوا ئەخات بو راستی ( محاذاتێ )میقاتێکی تر جا ئەو حالەش لە لای هیچیان دروست نیە جگە لە مالکی لە لای ئەوان ئەگەر راستی میقاتەکە لە راستی میقاتی شارەکەی خۆی بێت دروستە • وەك شامی بە مەدینە دا ئەچێت ئیحرام لە بیری عەلی نابەستێ وەدوای ئەخات کە لە راستی جەحفە کە میقاتی شامە دایبەستێ بەو مەرجە دروستە

ئەگەرنا دروست نیە •

## حالی سێیەم

ئەگاتە راستی میقاتێك لەوێ ئیحرام دانا بەستێت بۆ ئەوەی لە پاشان ئەگاتە میقاتێك لە وێوە دائەبەستێت جا ئەوحالە لە لای هەمویان دروستە •

دووەم بۆیە ئیحرام دانابەستێت چونکو لە پاشان ئەگاتە راستیمیقاتێکی تر ئەیەوێت لە وێ ئیحرام ببەستی جا ئەوە لە لای حەنەفی بێ مەرج دروستە وە لە لای مالکی دروستە بە مەرجێك کە راستی میقاتی دووەم راستی میقاتی شاری خۆی بێت وە لە لای شافعیو حەنبەلی دروست نیە • بە هیچ چۆر •

حالی چوارەم : لە میقات یا لە راستی میقاتبێ ئیحرام تێ ئەپەرێت بێ ئەوەی لە میقاتێکی تر یا لە راستی میقاتێکی تر ئیحرام ببەستێت جا ئەمە گوناهباریش ئەبێ وە خوێنیشی لە سەرە مەگەر بگەرێتەوە میقاتەکەی یان راستی میقاتەکەی کە بەجێی هێشتۆوە وە لەوێ ئیحرام بەستێ پێشی ئیحرام بەستن وەپیش کردنی هیچ کردەوەیێکی حەج یا عومرە ئەمە خوێنەکە لا ئەچێت بەلام گوناه ئەمێنێ ئەگەر بە زاناییو بە قەستی وای کردبە ئەگەرنا گوناهیش نا مێنی •

پرسیار :ـ

ئەگەر بگەرێتەوە میقاتێك یا جێگەیێکی تر کە هەندی جێگەکە دور بێت وە یا بگەرێتەوە میقاتێکی نزیکتر یا جێگەیێکی هەندی میقاتە نزیکترەکە دروستە وەخوێنی لە سەر لائەگەوێت یانەنا ؟

وەلام نەخێر ئەمە لە هیچ ریبازێك دروست نیە وەشافیعیش کە ئەوەیان بۆ متمتع دروست کردیە بۆ ئیرەیان دروست نە کردیە چونکو لە حالی تەمەتوع مرو گوناهبار نیە بەلام لێرە دا گوناهبارە جا بۆیە لێرە دروست نیە گەرانەوە جگە بۆ نەفسی میقاتو یان جێگەیێکی هەندی میقات دور بیت •

## ( ئاگادار كردنەوەيێك )

ئەوەی كە بە تەیارە ئەچێت بو حەج یان عومرە باشتر ئەوەیە كە پێش سوار بونی تەیارە یان لە ناو تەیارە پێش گەیشتنە مەدینە ئیحرام بەستیت • جا ئەگەر ئەمە زەحمەت بو دروستە ئیحرام دوا بخات وە كە گەیشتە جیددە بچیت لە جەحفە ئیحرام ببەستیت چونكو لە حەنەفیدا دروستە ئیحرام لە میقات دوا بخەیت بۆ میقاتێكی تر • ئەگەر ئەوەش زەحمەت بو دروستە لە جیددە ئیحرام ببەستی لەبەر ئەم چەند قسەیە •

یەكەم لە ( بداية المجتهد )دا ئەفەرمویت چەندزانایێك ئەلێن ئەگەر مرۆ لە میقات تێ پەری بێ ئیحرام بەستن ئەمە قەیدی نیە وەخوێنیش لە سەر نیە • وە لە میزانی شەعرانیش‌دا ئەمە لە شیخ حەسەنی بەسری‌و نەخەعی نقل ئەكات جا لە سەر قسەی ئەوانە بروات وە تەقلیدی ئەوان بكات دروستە • چونكو تەقلیدی ئەو زاتانە دروستە دووەم لە رێبازی شافعی‌دا ئەگەر حاجی‌نەیزانی كە بە میقاتیكدا یان بە راستی میقاتێكدا تێ پەریوە ئەوە دوو قوناغ دور لە مەككە ئیحرام ئەبەستیت وە جیددە دوو قوناغ دورە • وە حاجیەكان نازانن كە تەیارە بە میقاتێك یان بە راستی میقاتێك تێ ئەپەرێت یان تێ‌ناپەریت سێەم من لام وایە كە تەیارە بە هەر جێگەدا بروات ناووترێت بە میقاتدا رۆیشت یان بە راستی میقاتدا رۆیشت چونكو بە زەمین‌دا ناروات تاكو بلێی ئەمە گەیشتە میقات وەیان راستی میقات وە لە شافعیش ئەفەر مویت ئەگەر نە بە میقات وە نە بە راستی میقاتێك دا رۆوییشت ئەمە دوو قوناغ دور لە مەككە ئیحرام ئەبەستێت چوارەم ئەگەر تەیارە بە راستی میقاتدا تێ‌پەریت لەم حالەش لە لای زانایانی حەدیسي شەریف راستی ( محاذی ) بە هیچ حیسابە ئەگەر بە میقاتدا نەچیت وە هەر چەند بە راستی میقاتدا بچیت هیچی لە سەر نیە وە لە كام جێگە ئیحرام ئەبەستی كەیفی خۆیەتی •

**پێنجــەم :**

لە مو غنــی ( ابن قدامــە )دا ئــەفەرمویــت کــە عەطــاو نەخــەعیو شیخ حەسەنی بەصری ئەڵێن ئەگەر کەسێك بی ئیحرام لە میقات تێ پەری هیچی لە سەر نیە وە لە کتیبی (الرحمه فی اختلاف الأمــه ) دا هەم وا لــە نەخەعیو حەسەنی بەصری روایەت ئەکات • جا لەو باســە دا ئەم چەنــد فتوایە هەن وەمرو تەقلیدی هەر کامیان بکات دروستە جا من ئەوەنــدەم توانی لەم باسە بنوسم وە تکا ئەکەم ئەگەر کەسێك ئەم باســەم بە هەڵــە ئەزانیت ئاگادارم بکات بەلام بە بەڵگــەو دەلیــلو ئیسپــات وەسوپــاسی ئەکـــــەم •

**باســی دووەم**

چونیەتی کردنی حەجو عومرە پە یێی دەست پێ کردنی لە میقاتەوە تاکو کوتایی پێ دێت ئەی حاجی بە رێز لە پێش دا زانیت کە مرۆ گەیشتە میقات نابی لە میقات تێ پەریت بە بێ ئیحرام بەستن • جا لە میقاتەوە بــە سێ جۆر ئیحرام دائەبەستریت یەکەم : ئیحرام بە حەج بە تەنیا جا بەو جۆرە ئەڵێن حەجیتەنیا • دووەم ئیحرام بە عومرەو بەس • جایەم جۆرەش ئەڵێن تەمەتتــــوع •

سێیەم : ئیحرام بە حەجو عومرە پێکەوە • جا بەم جۆرەش ئەڵێن لێکدان جا لەم سێ جۆرە کامیان گەورەو خێر ترە بابزانین •

لە لای حەنەفی لێکدان خیر ترە پاشان تەمەتتوع پاشان تەنها • وە لە لای مالکی تەنها پاشانلێکدان پاشان تەمەتتوع وە لە لای شافعی وە روایەتێك لە ئیمامی حەنەفی تەنها پاشان تەمەتتوع پاشان لێکدان وە لە لای حەنبەلی تەمەتتوع پاشان تەنها پاشان لێکدان • وە لە لای زانایانی حەدیس تەنها دروست نیە بەلکو ئەوەی کوشتی لە گەل خۆی ئەبات ئەبی بە لێکــــدان

یـكاوبەس چیدی بۆ دروست نیە وە ئەوەی لە گەل خۆی نابات بەس بە تەمەتتوع ئیحرام ئەبەستیو چیدی بۆ دروست نیـە • جا ئەو سـێ جـۆرە ئیحرامەت بۆ لەسێ لقدا باس ئەکەم بە یارمەتی خودای مەزن •

لقی یەکەم : باسی چونیەتی‌حەج بە تەنها ئەی برا کە گەیشتیە میقات وەویستت کە ئیحرام بە حەێ بە تەنها ببەستیت • بەم جۆرە بکە لە پێشـدا خۆت پاك بکە بە برینی نینۆك وە تاشینی دامەنت وە هەلکێشانی موی بن ملت وە بەرسمیل کردن پاشان پوختە خۆت بشو • پاشان خـۆت بـۆن خۆش بکە • پاشان دو پەشتمال لە خۆت لول بـدە یـەك لە مـل تانـاوك یەکێکی تر لە ناوك تا خوار ئەژنوت • وە باش وایە کە سپی بن وە زۆرتری ئەنگو ستانت بە دەرەوە بن بەلام ژن بە جلی خۆیەوە ئەمینی پاشـان دوو رەکعات سونەتی ئیحرام بکە پاشان بلێ خوایە نیەتم وایە دەست بە حەج ئەکەم ( لبیك اللهم لبیك لبیك لاشریك لك لبیك • ان الحمد والنعمة لـك والملك لاشریك لك ) یاخۆ بە کوردی وەك لە پێشدا بۆم نوسی ئەم زیکرە ئەکەیت پاشان ئەرۆیت بۆ مەککە وە کە گەیشتیە مەککە پاش حەسانەوە ئەچیتە مسجدالحرام وە حەوت کەرەت بە دەورەی کەعبەدا ئەسوریێت وە بەمە ئەلێن ( تەواف القدوم ) واتە تەوافی گەیشتنـە مەککە • پاشـان دوو رکعەت سونەتی تەواف ئەکەیت وەباشتر وایە کە لە مەقامی ئیبراهیـم دا بیانکەیـــت •

وە لە رەکعەتی یەکەمدا سورەتی ( قل یا ایها الکافرون ) ئەخوینێت • وە لە دووەم رەکعەتدا ( قل هو الله أحد ) ئەخوینی پاشان ئەچیت سەعی بەینی سەفاو مەروە ئەکەیت • جا بەم جۆرە لە ژێر ئیحرام ئەمێنی وە ئەبـی خۆي لە هەمو شتی قەدەغە کراو لە ئیحرامدا بپاریزیت وە لەم ماوە دا هەر چەند ئەتوانی تەوافی بەیت زۆر بکە وە نویژەکانت لە مەسجیدولحەرام بکـە • چونکـو پێغـەمبـەر درودی خـودای لە سـەر بێـت فەرمـویە

نوێژێك لە مەسجیدوالحرام ئەوەندەی سەدهەزار نوێژ لە غەیری وێ خێری هەیە • پاشان لە رۆژی هەشتەمی ذوالحەججە دا ئەچیتە مینا شەو لـەوی ئەکەیتەوە پاشان بەیانی کە رۆژی عالفەیە ئەچیتە عارەفات وە لەوی ئەمینی تاکو رۆژ ئاوا ئەبێت وە نوێژی عەسر لە عارەفات لە گەڵ نیوەرو ئەکەیت وەنوێژی شیوان دوا ئەخەیت لە گەڵ نوێژی عیشا لە موزدەلیفە ئەکەیت • وە لەو ماوەی کە لە عارەفاتی زۆر دوعاو پارانەوەو زیکری خوا ئەکەیت • چونکو لە عارەفاتدا دوعا گیرا ئەبیت وە خاوەنی کتێبی نەهر بە شیـــعر ئەو جێگانەی باس کردینە کە دوعالیان لێ گیرایە •
و مینشی کردم بەکوردی بۆت

دوعای بەنـدە گیرائەبێـت ئـەی بـرا
لـە کـەعبـەو لـە شیوو چیـای عـارەفـات

لـە مـوزدەلیفـــەو لـــە لای مولتـــەزەم
لە کـاتی تـەواف‌و سەعـیو رەجمـە هـات

لە حیجرو لـە لای زەمزەم‌و هـەم مەقـــام
لە لای سولکـەیی ئاو لە کەعبـەی نەجـات

پاشان کە روژ ئاوا بو ئەگەرێیەوە بۆ موزدەلیفە وە نوێژی شیوان‌و خەوتنان پێکەوە بە دواخستن لە وی ئەکەیت وە لە موزدەلیفە تا پاش نیوەی شەو ئەمینیەوە جا پاش نیوەی شەو ئەگەرێیەوە مینا وە لەوی بەیانی جێژنە حەوت بەرد ئەگریە کوسپەی گەورە • پاشان ئەگەر حەیوان بکوژیـەوە حەیوانەکە ئەکوژیتەوە • پاشان سەرت ئەتراشی یا چەند موویێك لە سەرت بە مەقەس ئەبریت وە تاشین خێر ترە • بەلام بـو ژن تراشین نیـە بەلکـو بەس چەند موویك لە سەری بە مەقـەس ئەبریت پاشـان ئەچیـت تـەواف ئەکەیت جا بەو تەوافە ئەڵێن ( طواف‌الافاضە )واتە تەوافی گەڕانەوە لـــە

عارەفات وەئەگەر پاش تەوافی قدوم سەعیت نە کرد بو سەعیش ئەکەیت ئەگەر کردبوت دوپاتی ناکەیەوە • پاشان رۆژی جێژنە ئەگەرێیەوە مینا وەسێ شەو لەوێ ئەبیت وە هەمو رۆژێ لە سێ رۆژی پاش جێژنە رەجمی هەر سێ کوسپە ئەکەیت وە هەر کوسپەیێك حەوت بەردی تێ ئەگری بەلام ئەگەر پێش رۆژئاوا بونی رۆژی سێیەمی جێژنە دەرچیت لە مینا دروستە وە مانەوەی شەوی سێیەم‌و رەجمی رۆژی سێیەمیشیی لە سەرت لائەچێت • جا کە لە مینا دەرچوی واتە حەجەکەت تەواو بو • جا دەست بە عومرە بکە بەم جۆرە • خۆت پاك ئەکەیت بە نینوك کردن وەبەر سمیل‌و دامەن تاشین‌و بن مل کێشان وەخۆت ئەشۆیت وە پەشتەمالی ئیحرام لە خۆت لول ئەدەیت وەئەچیتە مزگەوتی حەزرەتی عائشە وە لەوێ دوو رەکەعەتی سونەتی ئیحرام ئەکەیت وە ئەگەرێیەوە مەککە تەواف ئەکەیت وە پاشان دوو رەکەعەت نوێژی تەواف ئەکەیت پاشان ئەچیت سەعی ئەکەیت پاشان سەرت ئەتاشیت یا چەند مووێك لە سەرت ئەبریت جا ئەوە عومرەشت تەواو کرد جاکە ویستت لە مەککە دەرچیت‌و بگەرێیەوە • ئەچیت تەوافێك ئەکەیت وە بەم تەوافە ئەڵێن ( تەواف الوداع ) واتە تەوافی مال ئاوایی‌و دەرچون لە مەککە جا پاش ئەو تەوافە نابێ گیر بیت ئەبێ گورج لە مەککە دەرچیت • جا لەم جۆرە حەج کردنە دا هیچ حەیوان کوشتنەوەت لە سەر نیە مەگەر واجبێکت نە کرد بێت یا خو توشی حەرامێك بو بیت •

لقی دووەم باسی حەجی بە تەمەتتوع کردن :ـ

ئەی حاجی ئەگەر ئەتەوێت حەجی بەتەمەتتوع بکەیت کە گەیشتیە میقات • خۆت پاك بکە بە دامەن تاشین‌و نینوك برین‌و بن‌مل هەلکەندن‌و بەر سمیل کردن پاشان خۆت بشو پاشان خۆت بۆن خۆش بکە پاشان پەشتەمالی ئیحرام لە خۆت لول بدە پاشان دوو رەکەعەت سونەتی ئیحرام

بکه پاشان نیەتی عومره بینه بلێ خوایه نیەتم وایه عومره ئەکەم ( لبیك اللهم لبیك ) هتد جا ئەچیت بو مەککه وه که حەسایه ئه چیته مەسجدو لحەرام وه تەواف ئەکەیت جا ئەوتەوافه بەر تەوافیقدومو تەوافی عومره ئەکەویت پاشان سوننەتی تەواف ئەکەیت پاشان ئەچیت سەعی بەینی سەفاو مەروه ئەکەیت پاشان سەرت ئەتراشی یا خۆ چەند مو به مەقەس له سەرت ئەبرێت ئەوجا عومرەت تەواو بو وەئیحرام ئەشکینی وەهەمو شتیك که به ئیحرام حەرام بو حەلال ئەبێت جا بەم جۆره ئەمێنی له مەککه تاکو رۆژی پێش عالفه وه لەو ماوەدا هەر چەند ئەتوانی تەوافی بەیت بکه وه نوێژەکان له مەسجیدوالحەرام بکه وەهەر چەند ئەتوانی عومره بکه بەم جۆره له مالی خۆت خۆت بشو وه بەرگی ئیحرام له بەر بکەوه بچۆبۆ مزگەوتی حەزرەتی عائیشه وه لەوێ دو رەکەعەت سوننەتی ئیحرام بکه . ئەوجا نیەتی عومره بینه وه بلێ خوایه نیەتم وایه عومره ئەکەم ( لبیك اللهم لبیك ) جا دێیەوه مەککه وه تەواف ئەکەیت وه سوننەتی تەواف ئەکەیت وەسەعی ئەکەیت ئەوجا سەرت ئەتراشی وه یا چەند موویێك ئەبریت جا ئەمەیه عومره وەهەر چەند ئەتوانی له جیاتی باوکو دایکو خوشەویسیتانت بیکه وه خێری گەلێك زۆره .

جا له رۆژی پێش عالفه له قوناغی خۆت خۆت پاك ئەکەیتەوه وه خۆت بۆن خۆش ئەکەیت . وه پەشتەمالی ئیحرام ئەبەستیت وه دوو رەکەعەت سوننەتی ئیحرام ئەکەیت ئەوجا نیەتی حەج ئەینی وەئەلێی خوایه نیەتم وایه حەج بکەم لێم قەبول بکه ( لبیك اللهم لبیك ) هتد . ئەوجا شەو ئەچیته مینا شەو لەوێ ئەبیت پاشان بەیانی ئەچیته عارەفات تاکو پاش مەغریب لەوی ئەمینی وه نوێژی عەسر له گەل نیوەرو پێکەوه ئەکەیت پاش مەغریب ئەرۆیت بۆ موزدەلیفه وه نوێژی شیوان دوا ئەخەیت وه له موزدەلیفه له گەل نوێژی خەوتنان ئەیکەیت جا پاش نیوەی شەو

ئەچیت بۆ مینا وە لەوی حەوت بەرد ئەگریتە کوسپە گەورە پاشان گوشتی ئەکوژیەوە • پاشان سەرت ئەتراشیت یا چەند مو ئەبڕیت پاشان ئەچیتـــە مەککە وە تەوافی ئیفاضە ئەکەی پاشان سەعی ئەکەیت چونکو ســەعی پیشوت بۆ عومرە بۆ وەسەعی حەج ماوە پاشان ئەگەڕیتەوە مینا وەسێ شەویان دو شەو لەوێ ئەبیت وە هەمو رۆژێك رەجمی هەر سێ کوسپە ئەکەیت هەر کوسپەی حەوت بەرد پاشان ئەگەڕێیەوە بۆ مەککــە وەکـە ویستت لە مەککە دەرچیت تەوافی مال ئاوایی ئەکەیت جا لەم جۆرە حــەج کردنەدا واتە حەجی تەمەتتوع فیدیەت ئەکەویتە سەر وە بە چەند مەرجێك ئەوفیدیەت لە سەر لائەچیت جا با ئەومەرجانەت بۆ بلێین • یەکەم :ـ

لە لای شافیعیئەگەر بۆ ئیحرام دابەستن بـۆ حـەج لـە مـەککـە بگەڕێیەوە میقاتی خۆت یا جیگەیێك هەندی میقاتی خۆت لـە مـەککـە دوربیت یا هەر میقاتیك با لە هەمویان نزیکتر بێت یا جێگەیێك کە هەندی نزیکترین میقات دورە واتە ٥٤کم وە لەوێ ئیحرام بەحەج نوبکـەیـەوە وە بگەڕێیەوە فیدیەکەت لە سەر لائەچێت دووەم ئەگەر عومرەکەت لـە پێش مانگی شەووال تەواو کرد بێت دیسان فیدیەت لە سەر نیە سێیەم عومرەو حەج ئەگەر لە یەك سال نەبن فیدیە واجب نابێت •

چوارەم : ئەگەر حاجی دانیشتوی مەککە بێت یا خۆ لەو جیگانــە بێت کە لە بەینی میقاتو مەککە هەلکەوتون ئەمەش فیدیەیان لە سەر نیە وە لە لای مالیك لە پێنج جێگەدا فیدیـە واجب نابێت • یـەکـەم :ـ خەلکی مەککە بێت یا خەلکی ئەو جیگانە بێت کـە لـە بـەینی میقاتو مەککەنە ئەمانە فیدیەیان لە سەر نیە •

دووەم :ـ حەجو عومرەی لە یەك سالدا نەبن سێیەم :ـ پاش عومرە بگەڕیتەوە شاری خۆی یا خۆ جێگەیێك کە هەندی شاری خۆی دوربیت

له مه‌ككه وه له گه‌ڕانه‌وه له میقات ئیحرام ببه‌ستی فیدیه‌ی ناكه‌ویته سه‌ر •

چواره‌م عومره‌كه‌ی ئه‌گه‌ر له پێش شه‌ووالدا بو ئه‌وه‌ش فیدیه‌ی له سه‌ر نیه •

پینجه‌م :ـ ئه‌گه‌ر نیه‌تی دانیشمه‌ندی له مه‌ككه هینا فیدیه‌ی له سه‌ر نیه •

وه له لای حه‌نبه‌لی فیدیه واجب ئه‌بیت به چه‌ند مه‌رج •

یه‌كه‌م :ـ عومره‌كه له مانگه‌كانی حه‌جدا ببه‌ستی ئه‌گه‌ر له پێش مانگه‌كانی حه‌جی دابه‌ست فیدیه‌ی له سه‌ر نیه با كرده‌وه‌كانی عومره‌كه‌ش بكه‌ونه مانگیی حه‌ج وه‌ك یه‌كێك پێش مه‌غریبی رۆژی ئاخری ره‌مه‌زان ئیحرام به عومره دابه‌ستی •

وه كرده‌وه‌كانی له شه‌ووالدا ته‌واو بكات •

دووه‌م حه‌جو عومره له یه‌ك سالدا بكرێن ئه‌گه‌ر هه‌ر یه‌كه له سالێك بون فیدیه‌ی له سه‌ر نیه •

سێیه‌م پاش عومره كردن ئه‌گه‌ر دوو قوناغه ریگه له مه‌ككه دور كه‌وت وه له گه‌رانه‌وه له میقاتی رێگه‌كه‌ی ئیحرامی به‌ست فیدیه‌ی له سه‌ر نیه •

چواره‌م :ـ حه‌ج ئه‌هینیته سه‌ر عومره ئه‌گه‌ر وای كرد به‌لێكدان حیساب ئه‌كریت وه خوێنی لێكدانی له سه‌ره نه‌ك هی ته‌مه‌تتوع •

پێنجه‌م :ـ له دانیشتوانی مه‌ككه‌و جێگه‌كانی به‌ینی میقات‌و مه‌ككه نه‌بیت چونكو ئه‌وان فیدیه‌یان له سه‌ر نیه •

وه له لای حه‌نه‌فی له چه‌ند حالێك فیدیه‌ی له سه‌ر واجب نیه •

یه‌كه‌م :ـ ئه‌گه‌ر چوار سوری ته‌وافی عومره‌ی له پێش شه‌ووالدا بو فیدیه‌ی له سه‌ر نیه •

دووەم :ـ ئەگەر عومرەی خستە سەر حەج هەینێ ئەبێ بە لێکدان جا فیدیەی لێکدانی لە سەرە نەك هی تەمەتتوع وە گو نا هیشی ناگات •

سێیەم :ـ عومرەکەی بەتال نەکات ئەگەر بەتالی کرد واتە خوێنی بەتاڵ کردنی لە سەرە نەك هی تەموتتوع •

چوارەم :ـ حەجەکەی بەتال ئەکات ئەگەر نا لەو کاتـەش خوێنی بەتالکردنی حەجی لە سەرە نەك هی تەمەتتوع •

پێنجەم :ـ ئەگـەر پاش عومرە کردن گـەڕاوە مالی خۆی وە لـــە گەڕانەوە بۆ مەککە لە میقاتدا ئیحرام بە حەج ببەستی فیدیەی لـە ســە نیـــە •

شەشتەم :ـ ئەگەر حەجو عومرەی لە یەك سالدا نە بون فیدیەی لە سەر نیە •

حەوتەم :ـ ئەگەر نیەتی دانیشمە ندی لە مەککە هینا فیدیەی لە ســەر نیـــــە •

هەشتەم :ـ ئەگەر خەلکی مەککەو جێگە کانی بەینی میقاتو مەککە بیت فیدیەی لە سەر نیە •

## لقی سێیەم

## باسی چونیەتی حەج کردن بە لێکدان

ئەی برایەکەم کە گەیشتیە میقات وە ویستت حەج بە لێکدان بکەیت خۆت پاكـ بکەوە خۆت بشو وەخۆت بۆن خوش بکە وە جلی ئیحرام بکە بەرت وەسونتەتی ئیحرام بکە ئەوجا نیەت بینە وە بلێ خوایە نیەتم وایە عومرەو حەج پێکەوە ئەکەم ( لبيك اللهم لبيك ) هتد جا ئەچیتە مەککـە وە تەوافی قدوم ئەکەیتو نوێژی تەواف ئەکەیت وە سەعی ئەکەیت • جا لە ژێر ئیحرام ئەمینی تاکو رۆژی پێش عالفە وە رۆژی پێش عالفە ئەچیتە مینا شەو لەوێ ئەبیت بەیانی ئەچیتە عارەفات تارۆژ ئاوا بون لەوێ ئەبیتو نوێژی نیوەرۆو عەسر پێکەوە ئەکەیت بە پێش خستن • وە پاش مەغریب ئەچیتە موزدەلیفـە وەنوێـژی شیـوانو خە وتنـان بەپاش خسـتن لە موزدەلیفە ئەکەیت وە لە موزدەلیفە ئەبیـت تا پاش نیوەشـەو وە پـاش نیوەشەو ئەچیتە مینا وە رەجمی کوسپەی گەورە ئەکـەیت وە کوشـتی سەر ئەبری وە سەرت ئەتراشی یان کورت ئەکەیت وە ئەچیتە مەککـە تەوافی ئیفاضە ئەکەیت وە ئەگەرێیەوە مینا سێ شەو یان دوو شەو لەوێ ئەبی وە هەمو رۆژ هەر سێ کوسپە رەجم ئەکەیت هەر یەکە حەوت بەردی تێ ئەگریت • جا ئەگەرێیەوە مەککە وە کاتی گەرانەوەت تەوافی مالئاوایی ئەکەیت جا لەم جۆرەش فیدیەت لە سەرە بەلام ئەگەر پێش چونە عارەفات بگەرێیەوە میقات فیدیەت لە سەر لائەچێت جا ئەمە لە لای سێ پێشەوا حەجی لێکدان بەم جۆرەیە بەلام لە لای حەنەفی کە گەیشتیـە مەککـە

تەوافێكو سەعیێك ئەكەیت بۆ عومرە وە كە چوی بۆ عارەفات تەوافێك ئەكەیت بۆ تەوافی قدوم وە كە لە عارەفات گەرایەوە تەوافی ئیفاضەت كرد سەعیش ئەكەیت بۆ حەج چونكو سەعی پێشوت بۆ عومرە بو •

**تـی بینـی :**

تێبینی :ـ كەنیەت ئەینی وە ئەڵێ نیەتم وایە عومرەو حەج پێكەوە ئەكەم • ووشەی‌عومرە پێش ووشەی حەج ئەخەیت ، جا ئەو پێش خستنە لای حەنەفی باشە لە لای مالكی واجبە وە لە لای شافیعی‌و حەنبەلی كامی پێش ئەخەیت جیاوازی نیە •

**پسیارئەوفیدیەی لە حەجی بەتەمەتتوع وە لە حەجی بە لێكدان واجبـە چیـــە ؟**

وەلام : ئەو فیدیەیە بەم جۆرەیە ئەبێ حەیوانێكی‌وا سەر ببریت كە بۆ قوربانی بشێت وە گوشتەكە بداتە هەژاران جا ئەگەر ئـەوەی پێ نەكـرا چونكو پارەی نەبو یاحەیوان دەسـت نەكـەوت یاخـو بـە زێدە عەزافـە ئەفرۆشرا لە جیاتی ئەوە دە رۆژو ئەگریت سێ رۆژ لە حەج وە حەوتیان لە مال • جا بەوە ئەلێن خوێنی بە رێز واتە تاكو لە كوشتنـەوەی حەیـوان بێ‌توانا نەبێت بۆی نیە بچێتە سەر روژو گرتن وەبێ توانایێ لە حەیـوان بەم جۆرەیە حەیوان دەست نەكەویت یا خو دەست بكەوێت بەلام لە قیمەتی خۆی زێدە ئەیفروشن یا خۆ بە قیمەتی خۆی ئەیفروشن بەلام پارەت نیـە یا خۆ پارەت هەیە بەلام بۆ خۆت پیوێستت پێ هەبـە بۆشتی پێویـست نەك بۆ سەودایی وە یا دیاری كرین •

**« پرسیارێكی تر »**

**چ‌جۆرە حەیوانیكە كە دروستە بی گوژیتەوە ؟**

وەلام ئەو حەیوانە ئەبێ ووشتربێت یان مەربیت یان بزن یان گا یان مانگابێت وە ئەبی لە هەمو شتیكی كە گوشت كەم ئەكات پاك بێت واتـە

نابێت لەڕ بێت یا کوێر یا یەك چاو یان شەل یا گوێ براوبێت .... هند
جا ئەوە بریاری گشت پیشەوایە . بەلام لە تەمەینان خیلاف هەیە -

١ - وشتر لە لای هەمویان ئەبێ پێنج سالی تەواو بی وە پێ ی لە شەش سال نابێت .

٢ - وە گارەش لە لای سێ پیشەوا ئەبێ دو سالی تەواو کرد بیت وە پێ ی لە سێ نابیت . بەلام لە لای مالیك ئەبێ سێ سال تەواو بکات وە پێ ی لە چوار بنێت .

٣ - بزن لە لای شافیعی ئەبێ دو سال تەواو بکات وە پێ ی لە سێ بنێت وە لە لای ئەوانیتر سالێك تەواو بکات پێ ی لە دو بنێ بەسیەتی .

٤ - مەر لە لای مالیك ئەبێ سالێك تەواو بکات وە پێ ی لە دو بنێ . وە لە لای حەنبەلی شەش مانگ تەواو بکات بەسیەتی بە بێ مەرج وە لە لای شافیعی بە مەرجێ دانی پیشەوەی کەوتبن وە لە لای حەنەفی بە مەرجێ هەندی یەك سالە گوشتی تێدا بیت .

تێبینی

مەر بو یەك فیدیە ئەشێت وە بزنیش بۆ یەك فیدیە وە ووشتر بۆ حەوت . وە گارەش بۆ حەوت . جا لە لای هەر سێ پیشەوا دروستە بە حەوت کەس بە هاوبەش ووشترێك یا گایێك یا مانگایێك بکوژنەوە بەلام لە لای مالیك هاوبەشی دروست نیە

سودێك لە باسی کاتو جێگەی کوشتنەوە
وە دروست بونیئەوە کە خاوەنی لێ ی بخوات

لە لای حەنەفی کاتی کوشتنەوە لە بری تەمەتتوعو لێکدان رۆژی جێژنە پاش رەجمی کوسپەی گەورە دەست پێ ئەکات وە پێش سەر تاشین وەپێش ئەوکاتە دروست نیە چونکو ئەم رێزە واجبە رەجم پاشان کوشتنەوە

پاشان سەر تاشین • دروست نیە کوشتنەوە پاش چوار رۆژەی جێژنە بخرێت ئەگەر دوای خست ئەبێ حەیوانیکی تریش لە جیاتی دواخستن بکوژێتەوە وە دروستە خاوەنی لێی بخوات وە سێیەکی بۆ خۆی بخوات وەسیپەکی بدا بە دەوڵەمەندان وەك قوربانی ئەویش بەم جۆرە باشەوە جیگەی کوشتنەوە حەرەمـــی •

وە لە لای مالکی کاتی کوشتنەوە پاش بەیانی بەردانی رۆژی جێژنە دەست پێ ئەکات • وە سونەت وایە دووای رەجمی کوسپـەی گەورەی بخات تاکو رۆژ هەلدێت وە لە پاش روژەکانی جێژنەش دروستە بەلام بە قەزا حیسابە • وە جێگەی کوشتنەوە مەککەیە وە لە دەرەوەی مەککـە با حەرەمیش بێت یا مینا بێت دروست نیە • وە دروستە خاوەنی لێی بخوات وە لە لای شافیعی کاتی کوشتنەوە لە کاتی ئیحرام بەستن بە حەج دەست پێ ئەکات وە دروستە پێش بخرێت واتە پێش چونە عەرەفات لە مەککـە بکوژێتەوە وە کاتی کوشتنەوە هەتا هەتاییە وە جیگەی کوشتنەوە حەرەمە وە بۆ خاوەنی دروست نیە لێی بخوات ئەگەر هیچی خوارد ئەبێ جەبـی بکاتەوە بۆ هەژاران وە نابێ هیچی بدرێت بە دەولەمەندان •

وە لە لای حەنبەلی کاتی سەر برین رۆژی جیژنە دەست پێ ئەکات وە پێش خستنی دروست نیە وە لە رۆژی سێیەمی جێژنە کاتی دووایێ دێـت وە ئەگەر دوای خست لەم کاتە بە قەزا حیسابە • وە جێگەی کوشتنـەوە حەرەمە وە خاوەنی دروستە لێی بخوات •

### سـودێك لە باســی ئـەو کەســە

### لە بـری فیدیـە رۆژو ئەگـریت

لە لای حەنەفی ئەوەی حەجی بە تەمەتتوع یان لێکدان کردیە ئەگەر نەیتوانی کە کوشتنی سەر ببریت سێ رۆژان پاش ئیحرام بە حەجدابەسـتن

ئەگریت ئەگەر حەج دابەستنی لە مانگەکانی حەج دا بیت ئەگەر نا ئەبی دوا بخات تا مانگی حەج دێن وە باشتر ئەوەیە کە بۆ رۆژی حەوتەمو هەشتەم وە نویەمی ذی الحجە یان دوا بخات بەلکە لەو ماوە توانای سەر برینی ئەبیت بەلام دروست نیە لەم سێ روژە دواتر بخات وە حەوت روژەکانی تر کە هەمو کردەوەکانی حەجی تەواو کردن ئەگریت پاش چوار روژی جێژنە دەست پێ ئەکات وە لە هەر جیگایێ حەز ئەکات لە مەککە یان لە رێگە یان لە مال کەیفی خویەتی • وە ئەگەر سێ روژەکەی لە پێش جێژنە نە کردن ئەوە نابی رۆژو بگرێت بەلکو ئەبێ کوشتی سەر ببریت •

وە لە لای مالیکی کاتی سێ رۆژە لە کاتی ئیحرام بە حەجدا بەستن دەست پێ ئەکات وە نابی جێژنە بە روژو بیت وە مەکروهە دوای جێژنەیان بخات ئەگەر دوای خستن لە سێ روژەکانی پاش روژی جێژنە ئەبی بیانگریت بە واجبی ئەگەر لەوەش دوای خست چ کات حەز ئەکات با بە رۆژوبیت وە دروستە لە گەل حەوتەکە پێکەوە بیانگریت •

لە لای شافیعی کاتی سێ روژە لە گەل ئیحرام بە حەج دەست پێ ئەکات وە روژی جێژنە دروست نیە بە روژو بیت وە سێ روژەی دوای جیژنەش لە سەر قسەی نوی شافیعی دروست نیە بە روژو بیت وە لە قسەی کونی دروستە • وە سونەت ئەوەیە کە سێ روژە کە پێش رۆژی عالفە بخات وە کاتی حەوت روژەکەلە گەیشتەوە مال دەست پێ ئەکات واتە ئەگەر لە مەککە یان لە رێگە بیانگریت بەر ناکەویت •

وە ئەگەر سێ روژەی حەجی لە حەج پێ نەبو تاکو گەرایەوە مال نالە مالەوە بیان گریت بەلام واجبە چوار روژ لە بەینی سێ روژەو حەوت روژە بە روژو نەبیت • وە سونەت وایە سێ روژەکان یەك لە دوای یەك

بێ • هەروا حەوت رۆژە کەشی یەك لە دوای یەك بێ بۆ ماوە خستنە بەینیـــان •

وە لە لای حەنبەلی کاتی سێ رۆژە پاش ئیحرام بە عومرە دەســت پێ ئەکات بەلام باشتر وایە بیانخاتە پاش ئیحرام بە حەج وە سێیـەم رۆژ رۆژی عالفە بیت وەکاتی حەوت رۆژە پاش چوار رۆژی جێژنە دەسـت پێ ئەکات • بەلام باشتر وایە کە تا ئەگاتەوە مال دوایان بخات • ئەگـەر سێ رۆژەکە پێش جێژنە نەگریت با پاش جێژنە بیان گریت ئەگەر لە مەش دوای خست پاشان با بیانگریـت وە دروستـە لە گـەل حەوتـە لێکیـان بدات بێ ماوە خستنە بەینیان • یان بە ماوە خستنە بەینیان کەیفی خویەتی کوتایی لەلای سێ پیشەوا •

ئەگەر دەستی بە رۆژو کرد پاشان توانای کوشتی پەیدا بۆ لە سەری نیە بگەرێتەوە سەر کوشتــی وە رۆژوەکــان تـەواو ئەکـات • وە وازی لــێ ناهینــی •

بەلام لە لای حەنەفی ئەگەر لە روژەکانی جیژنەوە پیش سەر تاشین توانای بو رۆژوە کانی بەتال ئەبن وە واجیبە کوشتی سەر ببریت • بەلام ئەگەر پاش سەر تاشین توانای بو یا لە روژە کانی جیژنیش بیت ناگەرێتەوە سەر کوشتی یاخو پیش سەرتاشین توانای بو بەلام پاش روژە کانی جیژن بو دیسان سەر برینی لە سەر نیە • وە روژوەکان تەواو ئەکات •

**باسی دووەم لە باسی حـوکمی**
**کـردەوەکـانـی حــەج**
**لە ســەر هــەر پینج ریبــاز**

ئەی حاجی بە ریز لە پێشدا چونیەتی حەج کردنمان بـە هــەر ســێ چۆررۆن کردەوە • وە ئەو کردەوانەی لەو جورانەدا گوتـران هەمویــان فەرزنیە بەلکو هەندێکیان فەرزن وە هەندێکیان واجبن وە هەندێکیــان

سوننەتن جا با حوکمی هەمو کردەوێکت بۆروون بکەمەوە یەکە یەکـــە لە سەر پینج ڕێبازی پیروز وە لە دوو لقدا تەواوی ئەکەم ژمارەی لقی یەکەم ئەو کردەوانەی کە لە حەجی تەنها نوسران بیستوسێ کردەوەن وە لە سەر ئەو جۆرە ئەڕۆین چونکو ئەوە کردەوەکانی دوو جۆری تریش تێدایە وە زیاتریش جا کردەوەکان ئەمانەن •

١ ـ خۆ پاك کردن

٢ ـ خۆ شوشتن

٣ ـ خۆ بۆن خوش کردن

٤ ـ پەشتەمال لە خۆ لولدان

٥ ـ دوو رکەعەتی ئیحرام

٦ ـ ئیحرام

٧ ـ تەلبیـــە

٨ ـ بونی ئیحرام لە میقات

٩ ـ تەوافی قدوم

١٠ـ دوو رەکەعەتی تەواف

١١ـ سەعی بەینی سەفاو مەروە

١٢ـ شەوی عالقە لە مینا کردنەوە

١٣ـ ئامادە بون لە عارەفات

١٤ـ نوێژی عەسر هینانە پیش وە لە گەل نیوەرو کردن لە عارەفات

١٥ـ شەو کردنەوە لە موزدەلیفە

١٦ـ نوێژی شیوان دوا خستن بو گەل عیشا

١٧ـ رەجمی کوسپەی گەورە

١٨ـ سەر برینی حەیوان

١٩ـ سەرتاشین یا چەند موو برین

٢٠ـ تەوافی ئیفاضـــە

٢١- سی شەو یان دوشەوپاش جێژنە لە مینا مانەوە

٢٢- رەجمی هەر سێ کوسپە لە سێ روژەی پاش جێژن •

٢٣- تەوافی دەرچون لە مەککـە

جا ئەمە بون کردوەکانی حەج جا با یەکە یەکە حوکمی هەمویان بۆت روون بکەمەوە لەو لقەی کە دێت

**لقی دووەم لەباسی حوکمی گشت کردەوە کاندا**

## کردەوەی یەکەم خۆ پاك کردن

خۆ پاك کردن بە نینوك برین‌و دامەن تاشین‌و بن مل کێشان وە بەر سمێل کردن لە لای هەمو پێشەوا سوننەتە وە بۆیـە فـەرمانی پێ کراوە چونکو حاجی کە کەوتە ئیحرام قەدەغەیە ئەمانە بکات جا داوای لێ کرا لە پێشدا بیان کات تا توشی زەحمەت نەبێت وە یا توشی قـەدەغـە شکاندن‌و خوێن دان نەبێت •

## « کردەوەی دووەم خۆ شوشتن »

ئەوەش لە لای هەمویان سوننەتە بۆ هەمو حاجیێك بە جورێکیی وا ژنی حەیزدار یان مندال بۆی سوننەتە خۆی بشوات • جا ئـەگـەر ئـاو دەست نە کەوت یا خۆ توانای بەکار هێنانی ئاو نەبو لە لای شافیعی‌و قازی لە حەنبەلیان تیەمموم ئەکات بەلام لە لای حەنەفی‌و مالکی‌و غەیری قازی لە حەنبەلیان تیەمموم ناکات چونکو خۆشوشتن بو پاکیە وە پاکی لـە خاك نابیت • وە ئەگەر حاجی لە جیاتی خۆ شوشتن بەس دەسـت نوێژی شوشت بۆ ئەسلی سوننەت بەسە بەلام خۆ شوشتن خێر ترە •

## کردەوەی سێیەم خۆ بۆن خۆش کردن

ئەو کردەوەش لە لای چوار پێشەوا سوننەتـە وە لـە لای مالیك مەکروهە ئەگەر بۆنەکـە بۆ پاش ئیحرام بمێنی وە ئەگـەر بـەرگ بیت

دروسته مانەوەی بۆنەکە بۆ پاش ئیحرام لە لای هەر چوار پێشەوا بەلام ئەگەر بەرگەکەی داکەند نابی بیپۆشیتەوە تاکو لە بۆنەکەی نەشوریت وە ئەگەر بە بونەوە بپوشیت فیدیەی ئەکەویتە سەر •

## کردەوەی چــوارەم

دوو پەشتەمال لە خۆلدان یەکیان لە ملی تا ناوك وەیەك لە ناوك تاکو خوار ئەژنو وە نەعل لە پێ کردن ئەمەش سونەتە • چونکو واجب ئەوەیە کە شەرمەت داپیوشیت بە شێتێك وەبە جۆری لەبەر کردن نەبیت • بەلکو بە جۆری لە خۆلولدان بیت جا هەر بەرگیــك لە خــوتی لول بدەیــت وە شەرمەی پێ داپیوشیت با جلەکەی خوشت بێت وە لە هەر رەنگیك بیت دروستە • بو نمونە کەواکەت یا عەبا یا جوببە لە خوتی لولیدەی دروستە وەبیانخەیە سەر شان • یان باسکیان تێهەلکیش دروست نیە • بە کورتی هەرچی بــە جۆری لــە بــەر کردن بیت دروســت نیــە وە هــەرچی لــە خۆ لولدان بیت دروستە کە وابی دەرپێکەت لە خوتی لول دەی دروستــە وە پێی تێ بخەیت دروست نیــە وە ئــەبی ئــەنگوســتی پێو هــەردو قحاچەکانت بە دەرەوە بن جا بۆیە وا دائراوە نەعل لــە پا بکەیت وە ئەبــێ سەریش روت بیت جا ئەمە بۆ پیاوان وایــە بەلام ژن بە بەرگــی خــۆی ئیحرام ئەبەستی وە ئەبێ هەمو لەشو موی خۆی داپۆشیت بەس دەم چاوو دەستەکانی تاکــو بازنی دەســت واجبــە بــە دەرەوە بیت وە نابی دایان بپۆشیت وە سونەت وایە بەرگی سپی لە بەر بکەن •

## « کــردەوەی پێنجــەم »

دوو رەکعــەتی ئیحرام سونەتن لــە لای هــەمویــان وە ئــەگــەر ‌ڕامی پاش نوێژێکی فەرز دابەست بەر سونەتە کە ئەکەویت هــەروا سونەتــە لــە سونەتــی ئیحــرامــدا لــە رەکعــەتی یەکــەم ( قل یا ایهــا الکافرون ) بخوێنی وە لە هی دووەم ( قل هو الله أحد ) •

## کردەوەی شەشەم ئیحرام

ئیحرام لە لای چوار پیشەوا روکنە وە لە لای حەنەفی شەرتە ج ئەنجام یەکە چونکو لای هەموییان ئەگەر ئیحرام نەبو حەج بەتالە وە ئیحرام بە مانا نیەت هینانە جا ئەوە فەرزە وەك نیەتی نوێژ جا هەر کەس ئیحرامی بەست واتە نیەتی حەج یا عومرەی هینا چەند شتێکی حەلالی لە سەر حەرام ئەبن جا با لێرە دا باسی ئەو شتانەت بۆ بکەم • کە بە ئیحرام قەدەغە ئەبن هەمو پیشەوا یەك قسەن لەوە کە ژن و پیاو وەك یەکن لەو شتانەی کە لە ئیحرامدا قەدەغەن بەس لە بەرگ و داپوشین وەك یەك نینە چونکو ژن ئەبێ بە بەرگی خۆی ئیحرام ببەستی وە ئەبی هەمو لەشی خۆی داپوشی جگە لە دەم و چاوی و هەردو دەستی وە دەم و چاوی دەر ئەخات وە دروست نیە لە کاتی نوستنیش دەم و چاوو دەستی داپوشی • وە ئەگەر داپوشی فیدیەی ئەکەویتە سەر بەلام ئەگەر لە خەرابە ترسا ئەبی دەم و چاوی داپوشی وە لە لای حەنبەلی دروستە پوشیەکەی بە دەم‌چاوی بکەویت هەم دروستە شتێکی بخاتە ژێر پوشیەکە کە لە دەم و چاوی بلند کات • وە لە لای مالیکی دروستە بە دەم وچاوی بکەویت وە نابی هیچ شت بخاتە ژێری وە لە لای حەنەفی نابی پوشیەکە بە دەم و چاوی بکەویت • وە بۆ پیاو دروست نیە هیچ شت لە بەر بکات نە کەوا نە کراس نە پانتور نە شلوار نە گوری بەلکو پەشتەمال یاقوماش یا بەرگێك لە خۆی لول ئەدات جا بۆ روون کردنەوە ئەمو شتێك بە جۆری لە بەر کردن حەرامە وە بە جۆری لە خوو اولدان حەلالە بو نمونە مرو عەبایەکەی یا کەوایەکەی لە خۆ لولدات دروستە وەئەگەر بیانخاتە سەر شان دروست نیەو دەستیشیان تێ هەلنەکێشیت •

هەروا نابێ سەری بە هیچ شت داپوشیت بە جوریکی وا ئەگەر سەری بریندار بو وە شتێکی لێ بەست فیدیەی لە سەرە • بەلام

داپوشینی دەم‌و چاووی لە لای شافیعی‌و حەنبەلی دروستــە وە لـە لای مالیکی‌و حەنەفی دروست نیە جا ئەوە بو کە ژن‌و پیاو تێدا جیاوازن وە ئەوەی کە بۆ هەردوکیان قەدەغەیە ئەوانەن •

یەکەم :ـ لە گەل ژن ئیش کردن‌و گەمــەو گالتەو ماچ لـە گــەل یــەکتر کردن •

دووەم :ـ دەست درێژ کردن بۆ نێچری دەشتی کە گوشتی بوخریت بە کوشتن یان کوشتنەوە یان پیشاندان بەلام نینێری ئاوی حەلالە •

سێیەم :ـ بونی خۆش لە خو دان چ لە لەش چ لە بەرگ وەبڕینی نینوك یالابردنی مو بە هەر جوریك بیت وەهی هەر جێگەیێك بیت بەلام مووێك کە زەحمەتی زوری لێ ببینی لە لای مالیك دروستە لایبەی وە فیدیەی بدەیت • وە لە لای هــەمو پیشــەوای تر موی‌کــە لـە ناو چاو دەرئەچیت بێ فیدیە لائەبردریت وە لە لای چەنــد زانــای تر بــەس مـۆی سەر نابیت لاببریت ئەویتر گشتی دروستە بیتاشی یان بی بریت یا هەلکیش هی هەر جیگەیێك بیت بێ فیدیەو بێ قەیدی • چونکو خوا بەس نەهی لە لا بردنی موی سەر کردیە وە ئەفەرمویت • ( ولا تحلقوا رؤوسکم حتی یبلغ الهدی محله )

چوارەم :ـ لە بەر کردنی جلی رەنگ کراو بە شتیکی کە بۆنی خۆش بیت •

پێنجەم :ـ بڕین یا هەلکەنــدن یا لــە ناوبردنی گیاو پــوشی حــەرەم جگە لە گیای ئوذخرو گیای سینامەکی • ئــەم دووە قەیــدی نیــە • جــا ئەوانەن شتی قەدەغە کراو لە ئیحرامدا • وە هەر کەس شتیك لەوانــە بکات فیدیەی ئەکەویتە سەر وە ئەو شتانە لای هەمو پیشــەوا قەدەغــەن وە هەندێ شتی تر هەنە کە لە لای هەندێ پیشــەوا قەدەغــەن وە لــە لای هەندیکیی تر قەدەغە نیــە •

جا ئـەوانیش ئەوانەن :ـ

١ ـ مارە برِین واتە ئەوەی لە ئیحرام دایە لای سێ پێشەوا نابی مارەیـی ببرِێت نە بە خۆی نە بە کەس وە ژنیش نابی لە ئیحرامدا خۆی مارە بکات وە یاقەبولی مارەکردن بکات وە هەر جۆرە مارە برِینێك لە ئیحرامدا کرا بە تالە وە نابیت وە لە لای حـەنەفی مارەیەکـە دروستە بـەلام گوناهی ئـەکات •

٢ ـ دەست درێژ کردن بۆ نیچیری دەشتی گوشت نە خوراو ئەمە لـە لای شافیعیو حەنبـەلی دروستـە وە لـە لای حەنـەفیو مالیکـی دروست نیە هەروا لە حەیوانی دەشتیو ئاوی قسەیان دوو جۆرە • لە لای سێ پێشەوا ئەوەی زاوەزە لە دەشت بکات ئەمە دەشتیە بالە ئاویشا بژیت وە ئەوەی زاوەزە لە ئاو بکات ئاوییە با لە دەشتیش بژیت کە وابی بۆق لە لای ئەوانە ئاویـە چونکو زاوەزە لـە ئاودا ئەکات • وە لە لای شافیعی ئاوی ئەوەیە کە لە ئاوا نەبیت ناژیت وە ئەوەی لە دەشت ئەژیت وە یا لە دەشتو لـە ئاودا ئـەژیت ئەمـە دەشتیە • کەوا بیت بوق لە لای ئەو دەشتیە هەر چەند زاوەزە لـە ئاودا ئـەکات •

چوارەم شتی بۆن خۆش بـون کردن وە یان هـەلگرتنیان وە یان ئەوە لە جێگەیێك کە بۆنی خوشی تیدایە وەك دوکانی بۆن فروش • جا ئەوانە لە لای حەنەفیو مالیکی پەسندن جا نیازی بۆن کردنی هەبیت یە نەنا وە لە لای شافیعیو حەنبەلی ئەگەر لە گەل نیازی بۆن کردندا بیت • ئەمە حەرامە وە ئەگەر ئەو نیازەی نە بیت حەلالە وە لە لای ابنوالحەزم هیچ قەیدی نیە بە جوریکیوا ئەگەر رەیحـان بگریـت وە لە سـەر دەمـی

دابنی وه بۆنی بکات قەیدی ناکات چونکو بەس نەهی لە خو بۆن خۆش کردن کرایە نەك لە بۆن خۆش بۆن کردن •

پێنجەم :ـ دەست یا پێ لە خەنە گرتن لە لای حەنەفی‌و مالیکی هەر جێگەیەك لە ئیحرامدا حاجی خەنەی بکات چ ژن چ پیاو حەرامە چونکو خۆ بونخوش کردن حەرامە وە خەنەش بۆن خوشە • وە لە لای شافیعی بۆ ژن نا پەسندەو بەس • وە بو پیاو لە دەست‌و پیدا بێ پێویست حەرامە وە لە سەریش دروست نیە چونکو ئەمە داپوشینە وە داپوشین بۆسەر حەرامە وە لە جێگای تر قەیدی ناکات •

وە لە لای حەنبەلی خەنە کردنی هەر جێگەیێك بێت‌بۆ ژن‌و پیاو دروستە جگە لە سەر • بۆ سەر دروست نیە چونکو داپوشینی لێ پەیدا ئەبیت • وە داپوشینی سەر حەرامە •

شەشەم : خواردن‌و خواردنەوەی شتی بۆن خۆش جا ئەوەش دو جۆرن یەکەم کولاو وەك چای بە هێل • وە نە کولاو • جا لە لای مالیکی ئەگەر شتی بۆن خۆش کولا بە جورێك کە قەبالەی نەما ئەمە حەلالە خواردن‌و خواردنەوەی یا بۆنەکەش یا رەنگی ئاشکرا بێتەوە ئەگەر قەبالەی ما دروست نیە یا بۆنەکەو رەنگەکەش نەمابێت • وە هەندێ لە مالیکیان ئەفەرمون مادام کولا حەلالە با قەبالەو بونیشی بمێنێ وە ئەگەر نەکولا حەرامە وەك ئەو بونانە کە لە گەل خواردن یاخواردنەوە تێکەل ئەبن •

وە لە لای شافیعی‌و حەنبەلی ئەگەر شتیکی بۆن خۆش کەوتە خواردنێك یا خواردنەوەیێك دروست نیە بیخویت‌و بیخویتەوە تاکو وای لێ دێت نە بون نە تامی نامینی جا هەینی دروستە باقەبالەش بمینی • جا ئەوە جیاوازی نیە چ کولاو بێت یا کولاو نە بێت •

وه له لای حه‌نه‌فی ئه‌گه‌ر شتیکی بین خۆش که‌وته ناو خواردنێك یا خواردنه‌وه‌یێك وه له گه‌لی تێکه‌ل بو ئه‌گه‌ر کولاو بو وه به کولین بۆن خوشه‌که گورا دروسته بیخویت وه بیخویه‌وه یا بونه‌که‌ش مابیت وه ئه‌گه‌ر نه‌کولاو بیت ئه‌گه‌ر خواردنه • وه بۆن خوشه‌که زۆر که‌متر بو له خواردنه‌که ئه‌گه‌ر بونی مابو ناپه‌سنده وه ئه‌گه‌ر نا هیچ قه‌یدی نیه وه ئه‌گه‌ر بۆن خوشه‌که زۆر تر بو ئه‌وه جه‌زای تیدایه • وه ئه‌گه‌ر شته‌که خواردنه‌وه‌یه ئه‌گه‌ر بۆن خۆشه که زۆر تره ئه‌وه فیدیه ئه‌بی بدات ئه‌گه‌ر بخواته‌وه • وه ئه‌گه‌ر خواردنه‌وه‌که زۆرتره ئه‌وه ئه‌بێ سه‌ده‌قه‌یێك بکات به‌لام ئه‌گه‌ر چه‌ند جار بخواته‌وه ئه‌مه خوێن واجیب ئه‌کات • جا ئه‌وه گشتی له‌وه دایه که شتی بۆن خۆش له گه‌ل خواردن‌و خواردنه‌وه تێکه‌ل بیت به‌لام ئه‌و شتانه‌ی بۆ خواردنن وه‌بێنیان خوشه وه‌ك سیو یان ، پورته‌قال ... هتد •

ئه‌مه هیچ زیان له خواردنی نیه لای هه‌مو پێشه‌واکان وه له لای ابینی • حه‌زم ئه‌م شتانه‌ی پێشه‌وه‌ش هیچ زیانی نیه •

**حه‌وته‌م :ــ چاو رشتن**

چاو رشتن به شتیکی که بۆنی خۆشه حه‌رامه له لای گشتیان وه به‌کلیکی که بۆنی خوشی تێدا نیه له لای سێ پیشه‌وا دروسته وه له لای مالیك چاور رشتن حه‌رامه به هه‌ر شتیك بیت به‌لام ئه‌گه‌ر بۆ پێویستێك بیت دروسته به شتی بێ بون وه‌په شتی به بۆن به مه‌رجی فیدیه دان وه له لای ئیبن‌و حه‌زم چاو رشتن به هه‌مو شتیك حه‌لاله‌و هیچ زیانی نیه •

هه‌شته‌م :ــ خۆ چه‌ور کردن • له لای شافیعی‌و حه‌نبه‌لی خۆ چه‌ور کردن به شتیکی بۆنی خۆش بیت حه‌رامه وه به شتی بێ بۆن حه‌لاله له هه‌مو له‌ش جگه له سه‌رو ده‌مو چاو له لای شافیعی •

وه له لای حەنبەلی سەرو دەمو چاویش قەیدی نیه وه لای مالیکی خۆ چەور کردن به هەمو شتیك حەرامه • بۆنی هەبی یان نەبیت • وه هەر کەس خۆی چەور بکات فیدیەی لە سەره بەلام بو پیویست به شتی بێ بۆن بێ فیدیه دروسته وه به شتی به بۆن بەفیدیەوه دروسته له دەستو پێ بەلام له جێگەی تر دو قسەیان هەیه •

وه له لای حەنەفی به بۆن خۆش حەرامه وه به شتی بێ بۆن حەلاله وه به شتیکی بۆنی تێکەل کراوه ئەگەر بۆ دەرمان کردن بیت دروسته ئەگەرنا دروست نیه •

نویەم :ـ خۆ خوراندن ئەگەر به جورێك بیت موی پێ بوەریت یانزیندەواری ناو سەر بکەویت حەرامه لای هەمویان وەئەگەر به هێمنی ت وه هیچی پێ نه کەویت له لای سێ پیشەوا حەلاله وه لەلای مالیك ناپەسنده وه لەلای ئیبنو حەزم بەهەمو جورێك دروسته •

دەیەم :ـ خۆ شوشتن یان دەست شوشتن بۆ چلك لا بردن بەبێ صابون وه به صابونیکی بونی هەبیت لەلای شافیعیوحەنبەلی دروسته •

وه له لای حەنەفی که بۆنی هەبیت دروست نیه • وه له لای مالیك شوشتن بۆ چلك لا بردن دروست نیه جگە بۆ دەستان وه به مەرجێ به صابونی بێ بون بیت • وه به بوندار دروست نیه چ صابون بیت چ شتیکی تر بیت • وه خو شوشتن به شتیکی که زیندەواری لەش بکوژیت لای هەندێ حەرامه •

وه له لای ئیبنحەزم خۆ شوشتن دروسته به شتی به بونو بێ بون وەشتی زیندەواریش بکوژیت وه خو هەلکراندن بەلیفکه له حەمام ئەوانه گشتی دروسته وه زیانی نیه •

یازدەم :ـ سیبەر له سەر خۆ کردن له لای شافیعی دروسته به هەموو شتیك با شتیك بیت که به سەرو دەمو چاوەوه بلکێت • بەلام ئەگەر

عبەبایێکی بە سەر خۆ دادا وە دایپوشی حەرامــە وە یا زەنیلیکــی لە ســەر سەری دانا بە نیازی سەردا بوشین حەرامــە یا بــەرەواژیش نــە بیت وە ئەگەر بەرەواژی بیت حەرامە نیازی هەبێت یانە نا •

وە لە لای حەنبەلی سیبەر کردن بە شتیکی کە لە گەلی ئــەروات وەك سەیوان ئەمە حەرامــە •

وە ئەگەر بە شتیك بیت کــە لە گــەلی ناروات وەك دار یا خیوەت قــەیدی نیــە •

وە لە لای حەنەفیو مالیکی دروستە بە هەمو شیتك بە مەرجێ بــە سەری نە کەوێت ئەگەر بە سەری کەوت حەرامــە •

دوازدەم :ـ خوێن لە خۆ بەردان بە کەلــە شاخ یان بــە شتیکیی تــر جا ئەوە لای سێ پێشەوا دروستە بە مەرجێك موو تاشینی لێپەیدا نــە بیت ئەگەر نا حەرامە • وە لە لای مالیك ناپــەسندە بێ پێویست وە بــو پێویست دروستە بەلام ئەگەر لە سەری بو وە برین پێچی لە ســەر دانا فیدیەی ئەکەویتە سەر چونکو داپوشینی سەر حەرامە •

## کوتایی لە باسی ئەو کەسە شتێك

## لــەو قــەدەغە کــراوانە ئەکــات

یەکەم :ـ جوتبون ( جیماع ) لە لای حەنەفی جوتبون حــەج بەتال ئەکات چ لە کونی پیشەوە بکرێت • یا لە هی پاشەوە بەمەرجی ئەوەی لە گەلی ئەکەیت ئادەمیزاد بیت وە بە مەرجێ لە پێش وێستانی عەرەفات جوتبونەکە بکرێت جا جیاوازی نیە ئەوەی ئەیکات زانا بیت یا خۆ نەزان بیت بە سەهو بیت یانەنا وە بە خوشی بیت یان زۆر لێکراو بیت •

بە ئاگابیت یان نوستو بیت هی هــەمویان بــەتال ئــەبیت • ئاوی بێتەوە یاخو نێتەوە هەر کات سەرە سورەکە گوم بو لە کوێیکی ئادەمیزاد

چ پیش چ پاش ئەوە حەج بەتال ئەبیت • وە کـە حەج بەتال بو واجبـە بە بەتالیش تەواوی بکات وە لە سالی هاتو جێ بە جێ قەزای بکاتەوە وە مەریکیش بکوژێتەوە • وە چەند چار جوتبون دوپاتی بکاتەوە ئەوەندە مەرری ئەکەوتە سەر • بـەلام ئـەگەر لـە یـەك مەجلیس دوپاتی کراوە یەك مەر واجیبە جا بۆ هەرمەجلیسێك مەرێکی لە سەرە جا چەندی لەو مەجلیست کردبیت وە ئەگەر جوتبونەکە پاش وێستانی عەرەفات بیت وە پێش تەحللولی دووەم بیت حەج بەتال ناکات بـەلام کوتشیتێك واجیب ئەکات وە ئەگەر جوتبون لە گەل حەیوانێك بو ئەگەر گۆیـەکـە چووە ژورەوە وە ئاویشی هاتەوە کوشتییێکی لەسەرە وە ئەگـە ر ئاو نـەهاتـەوە هیچی لە سەر نیە جگە لە گوناە •

وە لە لای مالیکی جوتبون حەج بەتال ئەکات چ لە پێش چ لە پاش چ لە ئادەمیزاد چ لە حەیوان بە سەهو بیت یا نەنا زۆر لێ کراوبێ یا نە نا زانا بێ یا نە نا وە هی جیماع لێکـراویش بەتال ئـەبیـت ئەگـەر پێش ویستانی عارەفات بیت وە پاش ئیحرام بیت • وە ئەگـەر پاش وێستانی عارەفە بیت هەروا حەج بـەتال ئەکات ئەگـەر پێش تـەواو بونی رۆژی جێژنە بیت وە پێش رەجمی کوسپەی گەورەو تەوافی ئیفاضە بیت بەلام دوای رۆژی جێژنـە بەتـال ناکـات تەوافـو رەجمـی کـردبن یانـە نـا • وە ئەگەر پێش رۆژی جێژنە بیت ئەگەر پێش رەجمیو تەواف بیـت ئـەوە بەتال ئەکات ئەگەر نا بە جوریك رەجمی کردو جیماعی کرد پاشان تەوافی کرد یا خو تەوافی کردو جیماعی کرد پاشان رەجمی کرد لەو دوو حالـە حەج بەتال ناکات بەلام کوشتنەوەی ووشتریك واجیب ئەکات • وە لـە لای ئەوانیش هەر کەس حەجی بە جیماع بەتال کرد ئـەبی لە حـەجـە بەتالەکە دابروات تا کو تەواوی ئەکات • وە ئەبی لە سالی هاتو بێ دوا خستن قەزای بکاتەوە • وە ئەبێ حەیوانیك بکوژێتـەوە لـە کاتی قەزا

کردنی وه درومته پێش بخات وه که به جیماعێك حەجی بەتال بو هەر چەند جیماعی تر بکات فیدیەی دوقات نابیت وه ئەگەر جیماعی له یەکێك کرد وه زۆری لێ کرد بو ئەبێ حەجەکەی بێ بکاتەوه وه شووەکەی واجبه ئیزنی بدات بۆ قەزا کردنی حەجی بەتال کراوی جا ئەوه ئەگەر جیماع له گەل کراوەکە ژن بیت وه ئەگەر پیاو بیت هەم ئەبێ حەجەکەی بێ بکاتەوه ئەگەر به توبزیش • وای لێ کردوه •

( وه له لای شافعی جیماع )

کردن له پێش یان له پاشەوه له ئادەمیزاد یا له حەیوان حەجی جیماع کەرو جیماع لێ کراو بەتال ئەکات بەو چەند مەرجانە :ـ

یەکەم :ـ پێش تەحەللولی یەکەم بیت وه پاش تەحەللولی یەکەم حەج بەتال ناکات بەس فیدیه واجب ئەکات •

دووەم :ـ گو سورەکە بچیته ژورەوه ئەگەر نا بەتال ناکات •

سێیەم :ـ زانابیت که ئەمه حەج بەتال ئەکات وه له بیری نەچو بیت وه زۆر لێ کراو نەبیت کەواته ئەگەر نەیزانی که زیانی هەیه وەیان له بیری چوبو یا خو زۆرلێ کرابو حەجەکەی بەتال نابیت هەروا ژن به هیچ جورێك فیدیەی نا کەوتیه سەر یا حەجەکەشی بەتال ببیت بەلکو فیدیه بەس له سەر پیاوه • وه مروکه حەجی بەتال بو ئەبێ حەجەکە تەواو بکات وه له سالی هاتو بێ دوا خستن قەزای بکات وه فیدیەش بەم جۆره بدات ووشترێك بکوژێتەوه وه ئەگەر توانای نەبو رەشه ولاغێك ئەگەر توانای نەبو حەوت مەر یان حەوت بزن ئەگەر توانای نەبو قیمەتی یەك لەوانه تەعام ببەخشیت ئەگەر نەیتوانی لە جیاتی هەر مستێك تەعام روژوویك بگریت •

وه له لای حەنبەلی حەج به جیماع بەتال ئەبیت له پیش بیت یا لـــه پاشەوه بیت • له ئادەمیزاد بیت یان له حـەیوان • وه هی هـەردوکیان بەتال ئەبیت بەو چەند مەرجانــه •

یەکەم :ــ به مەرجێ پێش رەجمی کوسپەی گەوره بیت ئەگەر پاش ئەو رەجمه بیت بەتال ناکات بەلام ئەبێ مەریك یا بزنیك بکوژیتەوه یان تەعامی شەش هەژار بدەیت یان سێ رۆژو به رۆژو بیت هەم ئیحرامەکەش بەتال ئەبیت ئەبی بچیته دەرەوەی حەرەم ئیحرام نو بکاتەوه وه هەر کەس حەجی به جیماع بەتال کرد ئەبێ تەواوی بکات وه له سالی هاتو جێ بـــه جێ قـەزای بکات وه ئـەبی ووشتریکیش سـەر ببریت وه زاناو نـەزان وەله بیرچوو زۆرلێ کراو وه ژنو پیاو هەمو لەم حوکمه یەکسانن بەس ژن ئەگەر زۆر لێ کراو بیت فیدیەی له سەر نیــه •

( حوکمی پێشـــەکییەکانی جیماع )

له لای ئیبنو الحەزم جگه له جیماع به هیچ شتیك حەج بەتال نابیت ئاو بیتەوه یانێتەوه مادام گویەکه نەچیته ژۆرەوه حەج بـەتال نابیت وه قەبدی نیەو زیانی نیــه •

وه له لای حەنەفی گەمه کردن به دەست له مل کردنو لێ خراندنو دەست لێدان یا به ئارەزوو ڕگ له زگ خشاندنو ران له راندان به واته هەموی ئەبێ مەریك یان بزنیك سەر ببریت جا با ئاویش نەهاتیبیتەوه وه به تەماشا کردنی شەرمەی ژن وه بیر له جیماع کردنیش ئەو سەر برینەی له سەره به مەرجێك ئاوی بیتەوه ئەگەر نا هیچ وه جگه لەوه فیدیه واجیب ناکات بەلام حەرامه وەك خۆلێکخشاندن له سەربەرگ نەك به روتـی بـا ئاویشی بیتــەوه •

وه لــه لای مالیکی پێش رەوەکانی جیماع وەك جیماع وانــه وه هەمویان ئەگەر ئاویان پێ بێته خوارێ حەج بـەتال ئەکات • وه تـەماشا

ـێ کردنەوە لە جیماع ئەگەر درێژە بکیش وە ئاوی پێ بیتـەوە ئـەوانیش بەتال ئەکەن بەلام یەکەم تەماشا کردن وە یەکەم بیر کردنەوە بەتال ناکەن با ئاویشیان بێتەوە وە هاتنە خواری مەزی فیدیە واجیب ئەکات وە ئەگەر بـە تەماشا کردنی بێ ماوە بیت وە یا بیر کردنەوەی کەم بیت یان هەر لە خووە بێتە خوارێ هیچ واجیب ناکات •

وە لە لای شافیعی چگە لـە جیماع حـەج بـەتال ناکات با ئاویش بێتەوە بەلام ئاو هینانەوە بە دەستو و گـەمە بـە ئارەزو وەك ران لێك خشاندنو ماچو دەست لێدان ئەگەر ئاوی پێ هاتەوە فیدیـەی واجیب ئەکەن وەئەگەر تەماشای زۆر کرد یان بیری کردەوە هیچی لە سـەر نیە با ئاویش بێتەوە • وە ئەگەر بێ ئارەزو دەستی لێدا وە ماچی کرد ئەویش هیچی لە سەر نیە • وە ئارەزو برتیە لە هین هەلسان جا ئەو شتانەی کـە فیدیەش واجیب ئەکەن ئەگەر لە نەزانیو سەهوو لە بیر کردن بیت یان بەزۆر لێ کراو بیت هیچ فیدیـە واجیب ناکـەن • جـا فیدیـەی پێش رەوی جیماع ئەوەیە یا مەرێك ئەکوژێتەوە وە یا بزنیك یان سێ روژو ئەگریـت یان شەش مسکین تێر ئەکات نیوەروو ئیوارە لەمسێ شتانە خوێ موختارە کامی ئەکان •

وە لە لای حەنەفیو مالیکی فیدیە ئەوەیە ئەبێ مەرێـك یان بزنیـك بکوژێنەوە ئەگەر ئەمەی بو نەکرا دەروژو ئەگریت سێ لە حەج وە حەوت لە مال واتە بە کەیفی خۆی نیە کە کامیان ئەکـات • وە لـە لای حەنبـەلی پێش رەوی جیماع وەك هین لێ خشاندن لە غەیری جێگە کە • وە یـان ماچو خۆ تێهەلسوینوزۆر تەماشا کردنو یا زۆر بیر کردن ئەمە گشتیان ئەگەر ئاویان پێ هاتەوە • وە پێش تەحەللـولی یەکـەم بو ئەمـە ووشتـر کوشتنەوە واجیب ئەکەن وەئەگەر ئاو نەهاتەوە یا خو ئاو هاتـەوە بـەلام پاش تەحللولی یەکەم بو ئەمە کوشتنەوەی مەرێك یان بزنیك یان سێ روژو

یان شەش هەژار تێر کردن واجیب ئەکەن وە ژنیش لەم حوکمە وەك پیاو وایە جگە لەو ژنەی کە زۆر لێ کراو بیت •

## ( باسی نیچیرو دارو گیاو پوشی حەرەم برین )

هەمو زانایان یەك قسەن لەوە کە ئەو نیچیرەی پێغەمبەر یان یاران جەزایان دییار کردیە ئەوە چونیك دییار کراوە جەزای وایە • وە ئەگەر دییار نەکرا بو تەماشا ئەکرێ • ئەگەر وێنەی هەبو وەك بزنە کێوی مەسەلا وێنەی لە خومالی هەیە کە بزنە جا ئەوەی وێنەی هەیە مرو کەیفی خویەتی لە سێ شت یەکێك ئەکات • یەکەم یاوینەی ئەکوژێتەوە یا خو نرخی چەندە بە تەعام ئەدا بۆ هەژاران یان لە بری هەر مستیك روژوێك ئەگریت وە ئەگەر وێنەی نەبو نرخی چەندە یەتەعام ئەدات بۆ هەژاران یاخو لە جیاتی هەر مستیك روژوویك ئەگریت •

وە جەزای داری گەورەو وشتریکە وە هی کچکە مەرێك یابزنیك وە لە گیاو پوش نرخە کەیانە جا لەمە زیاتر ئەم باسە درێژ ناکەین چونکو پێویست نیە •

## ( حوکمی باقی قەدەغە کراوەکان )

بە لای حەنەفی کەسێك موی سەری یان ریشی یان هی دامەنی یابن ملی یان هی‌ملی یاهی هەر ئەندامێك ئەگەر هەموی یان چوارێکی تراش کرد •

ئەوە ئەبێ مەرێك یان بزنێك بکوژێتەوە ئەگەر بۆی نەکرا دەرۆژو ئەگریت سێ لە حەج حەوتیان لە مال• وە لە هەر ئەندامێك لە چوارێك کەمتر بتاشیت هیچی لە سەر نیە جا ئەوە ئەگەر بە بی عوزر بیت وە ئەگەر بە عوزر بیت حەیوانێك ئەکوژێتەوە یان سێ روژو ئەگریت یان شەش هەژار تێر ئەکات • دووەم :ـ ئەگەر شتێکی لە بەر کرد یا خۆ سەری خۆی داپوشی ئەگەر رۆژێك تەواو بەم جۆرە ماوە وە بێ عوزر بو خوێنی

به رێزی له سەره وه ئەگەر رۆژێك بەم حاله نەماوه وه دایکەند هیچی لـه سەر نیـه • وه فیدیـه بـه ژمارەی رۆژان زێده ئـەبیت بۆ هـەر رۆژێك فیدیەیێك واجیب ئـەبیت •

سێیەم :ـ ئەگەر ئەندامیکی تەواوی وەك ران یان قاچ یان باسکی یان دەم‌و چاوی یان ملی به هەر بۆنیك بۆن خۆش کرد یا خۆ جلی بۆن خوش کردو یەك رۆژی له بەر کرد • به مەرجێك جێگەی بۆن خوشکراو له بەرگەکه بستیك بەرین‌و بستێك درێژ بیت لەو حالانەشدا فیدیەی به رێزی له سەره ئەگەر بێ عوزر بیت وه فیدیەی خود موختاری له سەره ئەگەر به عوزر بێت وه ئەگەر کـەسێك سـەری خۆی خـەنـه بکات ئەگەر خـەنـەکـه قەبالەی هەبێت دو خوێنی له سەره یەك له بری سەرداپۆشین وەیەکیش له بری بۆنی خوشی و ئەگەر قەبالەی نەبیت یەك فیدیەی له سەره لـه بـۆن خۆش کردن وه ئەوەش ئەگەر بێ عوزر بیت فیدیەی بەرێزه وه ئەگەر به عوزر بیت فیدیەی خود موختاری واجیبه •

چوارەم :ـ ئەگەر ئەندامێکی تەواوی چەور کرد ئەگەر بۆ دەرمان کردن بیت قەیدی ناکات وه ئەگەر بێ عوزر بیت خوێنی له سەره •

پێنجەم :ـ ئەگەر پێنج نینوکی بڕین بێ عوزر خوێنی بەرێزی لـه سەره وه ئەگەر به عوزر بیت خوێنی اختیـاری وه له پێنـج کـەمتر هیچ قەیدی نیـــه •

وه له لای مالیکی هەر کەس له ئیحرامـدا بیت هـەر شتێـك کـه خوشی تێدا بێت یا چلکی پێ لاچیت ئەمه فیدیەی اختیاری واجیب ئەکات وەك یەکێك بچیته حەمام وه ئارەق بکات‌و ئاو به سەر خـۆی دابکـات فیدیەی له سـەره

دووەم :ـ دەست له بۆن خۆش بدات یان سمیل کورت بکات یان جل له بەر بکات به مەرجێ گورج داینەکەنێ یان سەری داپۆشیت یان ژن

دەم‌و چاوی داپپوشێ یا خۆ لە ئیحرامدا نینوك بكات یان موی بن مل بكێشێ یا خەنە لە ئەندامێكی یان لە سەری بدات جا برِینی یەك نینوك بە نیازی خوشی فیدیەییكی تەواو واجیب ئەكات • وە بە بێ نیازی خوشی یان بە عوزر مستیك تەعام واجیب ئەكات وە لابردنی یەك مو تا دوازدە مو مستێك واجب ئەكات • وە لە دوازدە قیمەیەی تەواوی لە سەرە وە لە لای شافیعی فیدیەی خودموختاری واجیب ئەبێت بەو شتانە •

یەكەم :ـ خۆ بۆن خوش كردن هەر چونێك بیت وە هەر چەندیك بیت • بەرگ لە بەر كردن سەر داپوشین وە بۆ ژن دەم‌و چاو داپوشین بێ عوزر وە یان بەعوزر بەلام پوشینیەكە بە دەموچاوی بنوسیت یا خۆ ژن دەستەوانە لە دەست بكات • وە یا چ ژن چ پیاو سێ مو ببرێت لە هەر جێگەیێك یا نینوكێك ببرێت یا جیگەیێك چەور بكات جا ئەمانە گشتیان بێ عوزر هۆی گوناەو فیدیەنە • وە بە عوزر بەس هۆی فیدیەیەبەلام گشتیان ئەگەر لە نەزانی یان بە سەهو یان لە بیر چون بێ یا بێ دەستی‌خۆی بۆ وەك زۆر لێ كراو •

وە یا لە شتێك خشاوە موی لێ هەلوەری ئەمە هیچی لە سەر نیە •

وە لە لای حەنبەلی حاجی فیدیەی خود موختاری ئەكەویتە سەر لەو چەند حالانەدا • یەكەم بەرگ لە بەر بكات •

دووەم :ـ بۆنی خۆش بەكار بینی •

سێیەم :ـ مرۆ سەری خۆی داپیۆشی یاژن دەم‌و چاوی •

چوارەم :ـ زیاتر لە دو مو لە لەش خۆی ببرِیت •

## « چەند ئاگادارییێك »

یەکەم :ـ حەیوان کوشتنەوە لە بری فیدیـەی شتی قـەدەغە کـراو ئەبێ لە حەرەم بێت • لە جیگە ی تر دروست نیە • بەلام ئەگەر تەعـام ئەدات یا خۆ رۆژو ئەگریت لە بری ئـەو فیدیەیـە ئەمـە کەیفـی خۆیەتـی نە هە، جێگە ئەیکات دروستە •

دووەم :ـ ئەوەی حەجی بە لێکدان کردیە لە لای سێ پێشەوا بەس یەك فیدیەی لە سەرە لە بری یـەك قەدەغە کـراو چونکـو کردەوەکانـی عومرەش لە گەل هی حەج بون بە یەك • بەلام لـە لای حەنـەفی ئەبـێ دو فیدیە بدات یەکێ لە بری حەج وە یەکێ لە بری عومرە •

سێیەم :ـ ئەگەر کەسێك دو شتی قەدەغەی کرد ئەگەر ئەو دو شتە ـو جۆرە وەك بلێین بەرگی لە بەر کرد وەخۆشی بۆن خۆش کرد ئەمـە ئەبێ دو کەفارەت بدات • بەلام ئەگـەر یـەك جۆر بون ئەگـەر شتەکـە کوشتنی نێچیرە ئەوەش چەند نیچیری کوشتیە ئەوەندە جەزایە ئەدات • وە ئەگەر نێچیرنیە ئەوە ئەگەر جیماعە ئەمە ئەگـەر هـەردو جیماع لـە دوو مەجلیس دابون ئەمە بۆ هی دووەم مەرێك ئەکوژێتەوە وە یان بزنیك نەك ووشتر •

وە ئەگەر هەر دوویان لە مەجلیسێك بون هیچی بۆ دووەم لـە سـەر نیـە • وە بۆشتە قەدەغە کراوەکانی تر ئەگەر لە یەك مەجلیس نە بو لـــە چەند مەجلیس کردویە هەندە کەفارەتە ئەبێ بدات • هەر وا ئەگەر لە یەك مەجلیس بون بەلام لە بەر دوو هۆ بون وەك دوو جار خۆی بون خوش کرد یەکێك بۆ خۆشی یەکێکی تر بۆ دەرمان دیسان دو کەفـارەت ئـەدات وە ئەگەر یەك هۆ بو وەك هەر دو جار بۆ دەرمان بو یان هەردو جار بۆ خۆشی ئەمە یەك کەفارەتـــە •

وه له لای مالیکی ئه‌گه‌ر جیماعه بۆ جیماعه‌کانی دوایی یـه هیچی له سه‌ر نیه چونکو گشتی له حه‌جی دروستدا نه بووه ٠ جا مه‌جلیس یه‌ك بیت یان یه‌ك نه‌بیت به‌لام شته قه‌ده‌غه کراوه‌کانی تر چه‌ند جار بیان کات هه‌نده که‌فاره‌ت واجیب ئه‌بێ مه‌جلیس یـه‌ك بیت یا نـه وه هۆیه‌ك بیـت یان نا ٠ وه له لای حه‌نبه‌لی ئه‌گه‌ر ته‌ده قه‌ده‌غه کراوی پاش که‌فاره‌ت دانی پێشو کرد ئه‌مه که‌فاره‌تی بۆ نو ئه‌بیته‌وه ئه‌گه‌ر هێشتا که‌فاره‌تی پێشوی نه دابو هه‌ر چه‌ند شتی قه‌ده‌غه‌ی کردبێ یه‌ك که‌فاره‌ته ٠ جا ئه‌وه بـۆ هه‌مو شتیك وایه جیماع بیت یان شتی تر بیت عیبره‌ت به پاش که‌فاره‌تو پیش که‌فاره‌ته وه له قسه‌یێکی تر لای احمد بۆ غه‌یری جیماع عیبره‌ت به هۆیه نه‌ك به که‌فاره‌ت ئـه‌گـه‌ر گشتی لـه بـه‌ر یـه‌ك هـۆ بێ ئـه‌وه‌نده که‌فاره‌تـــه ٠

وه له لای شافیعی له قسـه‌یـه‌ك وه‌ك حـه‌نبـه‌لی عیبره‌ت بـه پێش که‌فاره‌تو پاش که‌فاره‌ته وه له قسه‌ی تر عیبره‌ت به جێگه‌و ماوه‌یه ٠ واته ئه‌گه‌ر له دووجێگه بو دوو که‌فاره‌ته وه ئه‌گه‌ر له یه‌ك جێگه بو ئه‌گه‌ر ماوه که‌وته به‌ینیان دیسان دوو که‌فاره‌تـه وه ئـه‌گـه‌ر بێ ماوه بو یـه‌ك که‌فاره‌ته جا ئه‌مه بو جیماعو غه‌یری جیماع به‌م جۆره‌یه ٠

( باسی کرده‌وه‌ی حه‌وتـه‌م لـه کرده‌وه‌کانی حـه‌ج کـه گوتنی [ لبیك ]ه یـــه )

له لای مالیکی گوتنی ( لبیك )ه لای کـه‌می یه‌ك جار واجیبـه وه واجیبه ماوه‌ش نه‌خاته به‌ینی ئیحرامو ( لبیك )ه ئه‌گـه‌ر نـه‌یگۆت وه یا ماوه‌ی خسته به‌ینیان خوینێکی له سه‌ره به‌لام چـۆت کـردنی لـه گـه‌ل ئیحرام سونـنـه‌ته ٠

وه له لای حـه‌نه‌فی واجیبه ئیحرام لـه گـه‌ل زیکرێکی خوا بیت ئه‌گه‌ر نه‌کات ئیحرام دانامه‌زریت به‌لام خصوصی ( لبیك )ه سونـنه‌ته ٠

وه له لای مالیکی ئەگـەر جیماعـە بۆ جیماعەکانـی دوایـێ هیچـی له لای هەمویان سونەتە بۆ حاجی کە هەمیشە زۆر ( لبیك )ه بلێت بـە تایبەتی کە لە هەر بەرزییێك سـەر ئەکـەویت وه یان بـەره ژورێك نشێـو ئەبیتەوه وه کە خەلك ئەبینی وه لە پاش نوێژان وه ئەوه سونەتـە تاکو بەروی رۆژی عالفـە لـە لای مالیکی ● وه تاکـو رەجمی کوسپـەی گەوره لە لای هەرسێك پێشەوای تر ● وەمرو بە دەنگی بەرز ئەیلێـت وه ژن بە دەنگی نزم ئەیلێت ●

باسی کردەوەی هەشتەم لە کردەوەکانی حەج کـە ئیحرام بـەستن ئەبێ لە میقات بیت لە لای هەمو پێشەواییێك ئـەبێ ئیحرام دابەستن لـە میقات بیت ● جگە لە چەند کەسێك وه حوکمی ئەو کەسە کە لە میقات تێ پەریتو ئیحرام نەبەستیت لە پێشدا باسی کرا وەزاندرا ●

## تەوافـی گەیشتنـە مەککـە

تەوافی گەیشتنە مەککە لە لای سێ پێشەوا سونەتـە وه لە لای مالیکی واجیبە جگە بۆ ئەو کەسە کە حەج ئەخاتە سەر عومـره وه بـۆ تەواف چەند مەرجێك هەیە ● وه وا باشە لێرەدا ئەو مەرجانەت بۆ بلێـم :ـ

باسی مەرجەکانی دروست بونی تەواف :ـ

له لای شافیعی بۆ دروست بونی تەواف دە مەرج هەیە :ـ

یەکەم :ـ ئەبێ لە تەوافدا شەرمـەت دابپۆشـی وه ئەگـەر نەختێ لـە شەرمە دەرکەویت تەواف بەتال ئەبیت ● وه شەرمەیی پیاو بەینی ئـەژنوو ناوکە وه هی ژن هەمو لەشیەتی جگە لە دەمو چاوی دووەم ئەبـێ لە بـێ دەست نوێژی گەورەو کچکە پاكبێ واتە ئەگەر مرۆ لە تەوافدا دەسـت نوێژی شکا یا لەشی پیس بو تەوافی بەتالە ●

سێیەم :ـ ئەبێ لەشی لە هەمو پیسێیکی لێ نەبوراو پاك بیت ئەگــەر کەسێك پێی لە پیسێیك بنێت یان پیسێیکی بە لەشەوە بنوسێت تەوافی بەتـال ئەبیـت •

چوارەم :ـ ئەبێ بەرگـی پاك بیـت ئەگـەر یەکێـك پیسـێیکی لـێ نەبوراوی بە بەرگیەوە بیت تەوافی بەتالە • وە ئـەبێ جێگـەی تەوافیش پاك بیـت •

پێنجەم :ـ ئەبێ تەوافەکە لە ناو مەسجیدوالحەرام بیت جا کەیفـی خوێەتی نزیك لە کەعبە یان دور بیت بەلام لە دەرەوەی مەسجیدوالحەرام دروست نیە • وە ئەگەر لە سەر بانی مەسجیـدوالحـەرام تـەوافی کـرد دروستە با لە کەعبەش بلند تر بیت • وە لە لای هەندیکیـان لە بلنـد تـر دروسـت نیـە •

شەشەم :ـ ئەبێ لە راست بە راستی بەردی رەش دەست بە تەواف بکات ئەگەر لە پاش بەرد بە لای حیجرەوە دەستی پێ کرد ئەو سورەی بۆ حیساب ناکرێت • جگە لەوە کە بگەرێتەوە راست بەرد لە وێ دەست پێ بکاتەوە • وە ئەگەر پێش بەرد دەستی پێ کرد ئەو ئەندازەی پێش بەرد حیساب نیە • بەلکو لە بەردەوە بۆی حیسابە •

حەوتەم :ـ لە سور خواردندا کەعبەی بکەوێتە چەپە وە راستەی لە زەمزەمو مەقام بیت وە بەجورێکی وا بروات کە تەنشتی چەپەی هەمو بە بەردی رەشدا تێ بپەرێت ـجا ئەگەر کەعبە بخاتە لای راستەی ـتەوافی بە تالە وە ئەگەر هەموچەپەی بەبەردا تێ نەپەرێت • ئەو سـورەی بەتالە وە لە سور خواردندا نابێ پشتی یان روی بکاتە کەعبە ئەگەر وای کرد ئەو سورەی تێدا وایکردووە بەتالە بەلام لە سوری یەکەمدا لە راستـی بـەرد بەرامبـەر بەرد ڕائەوەستیت وەنیەتـی تەواف ئەهینـی وە گـورج

چەپەی لە کەعبە ئەکاتو دەست بە سوران ئەکات ، وە ئەگەر ئەو بەرامبەر راوەستانەی بۆنەکرا لە بەر قەلەبالغی یا نەیکات وە زیانی نیە وە لە سوری ..ایدا بەرە بەرە بۆ لای بەرد خۆی نزیك ئەخات بێ پشت یان بەر لە کەعبە کردن تا ئەگاتە بەرد وە ماچی ئەکات وە ئەگریێو دوعا ئەکات وە دەستی لێ ئەدات وە بە چاوی دائەهێنیێو ئەگەر ئەوەش بە زەحمەت ئەکرا با وازی لێبێنێ چونکو واجیب نیە •

هەشتەم :ـ واجیبە حەوت کەرەت سور بخوات بە دەورەی کەعبەدا ئەگەر نەختێکی کەم بو ئەبێ تەواوی بکات • وە ئەگەر کەوتە گومان لە ژمارە ئەگەر پێش واز هێنانە بالای کەمی بگرێو تەواوی بکات • وە ئەگەر پاش واز هێنانە زیانی نیە •

نویەم :ـ ئەبێ هەمو لەشی لە دەرەوەی کەعبە بێت لە هەمو تەوافدا ئەگەر دەستێکی یان سەری یان هەر جێگەیێکی خستە سەر شازەروان ئەو سورەی بەتال ئەبێت وە ئەگەر دەستی درێژ کرد بۆ دەست لە کەعبە دان ئەبێ لەو کاتە رابوەستێ ئەگەر لە سوراندا بو سورەکەی بەتالە مەگەر بگەرێتەوە ئەو جێگە کە دەستی درێژ کردووە • هەر وا ئەگەر لە سوراندا دەستی خستە سەر دیواری حیجری ئیسماعیل سورەکەی بەتال ئەبێت چونکو حیجرو شازەروان بە کەعبە حیسابن وە شازەروان دیوارێکە ئەندازەی دو بەشی گەز بلندە وە بە دیواری کەعبە نوساوە لە پێشدا لە سەر ئەم دیوارە کەعبە دروست کرابو • کە کەعبە نو کراوە ئەو دیوارەیان بە جێ هێشت جا ئەو دیوارە کەعبەیە وحیجری ئیسماعیل جێگەیێکە لە کاتی خۆی لە کەعبەدا بو وە بەجێ هێشترا وە دیوارێکی لە دەورە کرا جا ئەویش لە کەعبە حیسابە •

دەیەم :ـ مەرجە نیەتی تەواف بۆ هەمو تەوافێك بێنێ جگە لە تەوافی ئیفاضەوقدوم بۆ ئەوان نیەتی ناوێت • وە لە لای مالیکی ئەو

شتانەی لە شافیعی مەرجن هەمویان مەرجن جگە لـە چـەند شتێك نـە بیـت •

یەکـەم :ـ لە لای ئەوان مەرج نیە جێگەی تەواف پاك بیت واتـە ئەگەر دەورەی کەعبە پیس بو دروستە تەوافی لە سەر بکات •

دووەم :ـ لای ئـەوان دروسـت نیـە تـەواف لـە سـەر بانـی مەسجیدوالحەرام وە لە جێگەیێك بەرز تر لە کەعبە بکرێت •

سێـەم :ـ لای ئەوان مەرجە سورەکان یەك لە دوای یەك بن ئەگەر ماوەیان کەوتە بەینی تەوافەکە بەتالە • لە لای شافیعی بەتالی نیـە •

چـوارەم :ـ ئەگەر لە تەوافدا بێ دەست نوێژ بو یا خو پێش نوێژی تەواف بێ دەست نوویژبو تەوافە کـەی بەتالـە چونکەنووێـژی تـەواف وەك بەشێـك لـە تـەواف واجبـە بـەلام ئەگـەر لە مەککـە دەرچـووە گەرانـەوەی زەحمەت بو نوێژەکە ئـەکات وە ناگەرێتـەوە وە کوشتییێك ئەنێری بۆمەکتکە لە وێ بیکوژنەوە •

وە لە لای حەنبەلی مەرجەکان ئەمانەن بەس نیەتو شەرمە داپوشین وە پاکی لە پیسی وە بێ دەست نوێژی گەورەو بچوك وە سورەکان حەوت بن وە رویشتن بۆ توانا وە سورەکان لە دوای یەك بن نابێ ماوەیان بخرێتە بـەینیان جگـە بۆ نوێژ کـە قامـەتی بـۆ کرا وە ئـەبێ سـوران لـە ناو مەسجیدوالحەرام بیت وە لە سەربان دروستە • وەبلند تر لـە کـەعبەش دروستە وە ئەبێ کەعبە بخاتە چەپەی • وە نابی هیچ لەشی بکەوێتە سـەر شازەروانو حیجری ئیسماعیل • وە لە روایەتێکی تر لە ئەحمەد پاکی لە بێ دەست نوێژی گەورەو کچکە مەرجی دروست بونی تەواف نیە بەلکو لەواجیبە کانی تەوافە •

وه له لای حه‌نه‌فی ئه‌م شتانه هیچیان مه‌رجی دروست بونی ته‌واف نیه جگه له مه‌که ته‌واف ئه‌بێ له ناو مزگه‌وتی حه‌رام بیت به‌لام شـه‌رمه داپوشین‌و پاکی له بێ ده‌ست‌نوێژی گه‌وره‌و کچکه وه رۆیشتن بۆ توانا وه که‌عبه خستنه چه‌په ئه‌وانه واجیباتی ته‌وافن واته بێ ئه‌وانه‌ش ته‌واف دروسته به‌لام خوێنی له سه‌ره وه بێ عوزر گوناه‌باریش ئه‌بێ • به‌لام به عوزر گوناه بارنیه به‌س واجبه خۆێنێك بدات •

## باسی چارەی تەوافی ژنی حەیزدار یـان منـال بـوی

پرسـیار :ـ

ئەگەر ژن خوینی حەیزی یان خوینی پاش منالی پێ داهات چارەی چیــە ؟

یەکـەم :ـ لە لای شافیعی ئەبێ چاوە نۆر بکات تاکو پاك ئـەبیت ئەوجا تەواف ئەکات ، ئەگـەر نـەیتوانی چاوەنور بکات با لـە گـەل هاورێکانی بروات تاکو ئەگاتە جێگەیێکی وا کە زەحمەتـە بگەرێتــەوە جا ئەوێ وەك مەنع کراو مەرێك یان بزنێك سەر ئەبرێت وە لە ئیحرام دەر ئـەچیت .

دووەم :ـ لە لای حەنەفیو حەنبەلی ئەچیت تەوافی خۆی ئەکات وە ووشترێك سەر ئەبریت چونکو تەرکی واجبی کردوە کە پاکییە . ئەگەر ووشتری نەتەوانی ڕەشە وولاغێك ئەگەر نەیتوانی مەڕێك ئەگەر نەیتوانی بزنێك سەر ئەبرێت ئەگەر ئەمەشی نەتوانی قیمەتی بزنێك تەعام ئەبەخشی ئەگەر ئەوەشی نەتوانی لە بری هەر مستێك روژووەك ئەگرێت .

سێیەم :ـ لە لای هەندێ لە حەنبەلیان دروسـتە تـەواف بکات وە هیچی لە سەر نیـە .

چونکو ئەوە وەکو ( فاقد الطهورين ) وایە کـە نوێژ ئـەکات بێ دەست نویژ وە گێڕانەوەشی لە سەر نیە .

چارەم :ـ شەیخی ئبن‌والحەجەر لە حاشیەی ئیضاحدا ئەفرمویت کـە زانایانی بەسرە فەرمویانە کە ئیمامی مالیك ئەفەرمویت ئەگـەر یـەکێك لە نەزانی یان سەهویان لە بیر چون تەوافی ئیفاضەی نەکرد وە گەراوە • ئەمە ئەگەر تەوافێکی کرد بیت بۆی بەر تەوافی ئیفاضـە ئـەکەویت وە هیچی لە سەر نیە • جا شَیخ ئەفەرمویت عوزری ژنی حەیزدارو خوینی پاش منال لە مە زیترە کە وابی ئەگەر تەوافێکی کردبێت بۆی بەر ئەکەوێت وە هیچی لە سەر نیە وە بەپێی ( ما جعل الله علیکم فی الدین من حرج ) دروستە ژن کە ئەوەی بە سەر هات تەقلیدی ئەم فتوایە بکات وە هیچی لە سەر نیە • هەروا کەسێك تەوافی ئیفاضەی بێ دەست نوێژ کرد لـــە نەزانی یان سەهو یان لە بیر چون با تەقلیدی ئەم قسەیە بکات • جاژنی والێ قەوما کەیفی خۆیەتی لەم هەمو فتوایانە تەقلیـدی کامیـان ئـەکات گوناهی لە سەر نیە وە هیچی لە سەر نیە • جا ئەو قسانە گشتی بۆ تەوافی ئیفاضەیە چونکو لە لای هەمویان تەوافی قدوم وەتەوافی دەرچونی لەم حالە دا لە سەر نیـە •

## باســـی کـردەوەی دەیـــەم

## دوورەکــــەعـەت نوێژی تـەواف

دوو رەکعەت نوێژ پاش تەواف بەنیەتی سونەتی تەواف لـە لای حەنەفی واجبن وە لە لای مالیك دوو قسەیە وە هەندێ ئەلێن پاش تەوافی واجیب واجبە وە پاش هی سونەت لـە لای شافیعـی دو قسـەیە واجـــب سونـــەت :ـ

وە لە لای حەنبەلی سونەتن وە لە لای هەمویان باش تر ئەوەیە کـە لە مەقامی حـەزرەتی ئیبراهیم‌دا بیانکات ئەگـەر زەحمـەت نـەبیت وە ئەگەر • زەحمەت بولە مزگەوتی حەرامدا بی کات وە ئەگەر لەویشـی نـە

کرد دروستە لە هەر جێگەدا بیان کات • وە کاتی لە پاش تەواف دەست پێ ئەکات •

وە لە لای سێ پێشەوا تا مردن کاتی کوتایی نابیت • وە لـە لای مالیکی دروست نیە ماوە بخرێتە بەینی نوێژو تەواف • وە لە لای هەمویان سونەتە لە رەکعەتی یەکەم ( قل یا أیها الکافرون ) بخوینی وە لـە هی دووەم ( قل هو اللە أحد )

« کردەوەی یازدەم سـەعی »

سەعی لە بەینی سەفاو مەروە لە لای حەنەفی واجیبە ئەگەر نەکرا بە خوێن جەب ئەکریت وە لە لای مالیکی‌و شافیعی فەرزە ئەگەر نەکرێت حەج‌بەتالە • وە لە حەنبەلی سێ قسە هەیـە •

یەکەم :ـ ئەلێت فەرزە

دووەم :ـ ئەلی واجیبـە

سێیەم :ـ ئەلی سونەتە وە قسەی یەکەمیان بە هیز ترە •

وە لە لای هەر چوار پێشەوا بۆ دروست بونی سەعی مەرجە لە سەفاوە دەست پێ بکەیت وە لـە مـەروە کوتایـی پێ بێـت • ئـە گـەر بەپێچەوانە کرا بەتالە بەلام لە حەنەفی قسەیێك هەیە ئەلێت ئـەگەر بـە پێچەوانە کرا ئەبێ دوپاتی بکاتەوە بەلام ئەگەر رویشت وە نـەگەراوە بۆی حیساب ئەکرێت • وە لە لای گشتیان واجیبە حەوت جار هاتو چۆ بکات وە ئەبێ بەینی سەفاو مەروە لە هەمو جارێکـدا گشـتی ببریـت • وە رویشتن لە سەفا بۆ مەروە بە جارێك حسابە • وە گەرانەوە لە مەروە بۆ سەفا بە جارێکی تر حیسابە وە واجیبە سـەعی لـە پاش تـەوافێکی دروست بوی بیت ئەگەر لە پاش تەواف نەبو یا خۆ لە پاش تـەوافێکی نادروست بو سەعیەکەی بەتالە • وە ئەبێ لە دوای تەوافێکی دروست

دوپاتی بکاتەوە • بەلام لە قسەیێك لای أحمد ئەگەر بە سەهو یان لـە بیر چون بو بەر ئەکەویت • ئەگەر بە قەستی بو بەر ناکەویت • وە لـە لای مالیکی ئەبێ لە پاش تەوافێکی واجیب بیت لە پاش تەوافی سونەت دروسـت نیـــە •

وە لە لای گشتیان ئەگەر کەوتە گومان ئایا حەوت کەرەتی تەواو کردیە یانە نا ئەبێ زێدە بکات تاکو دلنیا ئەبیت کە حەوت کەررەت هاتو جۆی کردیە وە بۆ پیاو سونەتە نەك بۆ ژن کە لە بەینی دو میلە سەوزەکان گورگە لوقە بکات • وە بۆ ژنو پیاو سونەتە کـە لـە کاتی هاتو چودا دوعا زور بکات بۆ خۆیو موسولمانان • وە کە گـەیشتـە سـەر سـەفا رابوەستیت وە بەر لە کەعبە بکات وە دوعا بکات • هەروا سونەتە لـە بێ دەست نوێژی گەورەو بچوك پاك بیت وە شەرمەی داپوشی کە وابێ بە بێ دەست نوێژیو بە لەشی پیسی وە بە روتی سەعی دروستە بەلام بێ ئەوانە خێر ترە وەبۆ حەیزدارو خاوەن خوێنی پاش مندال دروستە وەزیانی نیـە وە سونەتە کەماوە نەخاتە بەینی هاتو چونەکان یەك لە دوای یەك بێ وە دو رەکعەت پاش سەعی لە مزگەوتی حەرامدا بکات • جاوا ئەوا جەدوەلەتان پێش کەش ئەکـەم لە چەند حوکمـی تەوافی کەعبـەو سەعـی لە بەینی سەفاو مەروە بە پێی رێبازەکان •

## جەدوەلی باس‌کردنی چەند شتێک لە تەوافو سەعیدا

| کردەوە | حەنەفی | مالیکی | شافیعی | حەنبەلی |
|---|---|---|---|---|
| نیەتی تەواف | مەرجە | دوو قسەیە واجیب مەرج | مەرجە جگە لە تەواقی قدومو ئیفاحە | مەرجە |
| تەواف دەست پێ کردن لە بەردی رەشەوە | واجیبە بە خوێن جەبرئەکرێت | واجیبە | مەرجە | مەرجە |
| رۆیشتن لە تەوافدا بۆ توانا | واجیبە | واجبە | سوننەتە | مەرجە |
| پاکی لە بێ دەست نوێژی گەورەو بچوك | واجیبە | مەرج | مەرجە | مەرج واجیبە |
| تەواف لە پاش حیجری ئیسماعیل بێت | واجیبە | مەرج | مەرجە | مەرجە |
| ماوە نەخستن لە بەینی سور خواردنەکان لە تەوافدا | سوننەتە | واجیب سوننەت | سوننەت | مەرجە |
| بونی تەواف لە ناومزگەوتی حەرام | مەرجە | مەرجە | مەرجە | مەرجە |
| بونی سەعی لە دوای تەوافێك | واجیبە مەرجە | واجیب مەرجە | مەرجە | مەرجە |
| نیەتی سەعی | واجب | مەرج | سوننەت | مەرجە |
| دەست‌پێ کردنی سەعی لە سەفاو کوتایی لە مەروە | واجیبە | مەرجە | مەرجە | مەرجە |
| رۆیشتن لە سەعی بۆ توانا | واجیب | واجیب | سوننەتە | مەرج |
| لە دوای یەك هاتنی هاتو چووەکاری سەعی | سوننەت | واجیب مەرج | سوننەت | سوننەت |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ماوەنە حستی بەبۆ تەوافو سەعی | سونەت | سونەت | سونەت | سونەت |
| شەرمە داپۆشین لە سەعیدا | سونەت | سونەت | سونەت | سونەت |

تێ بینی :ـ

ئەوەی ووترا کە واجیبە چ لە سەعیدا چ لە تەوافدا بە نەکردنی فیدیەی بە رێز واجیب ئەبیت وە ئەوەی ووترا مەرجە لە تەواف بە نەکردنی تەواف بەتال ئەبیت • وە لە سەعیش سەعی بەتال ئەبیت • وە ئەوەی ووترا سونەتە زیانی نیە جگە لە خێر کەم بون • ئەگەر نەیکرد •

# باسی کردەوەی دوازدەم
# شەوی عالفە مانەوە لە مینادا

ئەو شەو کردنەوە لە لای گشتیان سونتەتە وە هەندێ زانا ئەڵێن سونەت نیە چونکو حەزرەت درودی خوای لێ بێت کە شەو ماوە لەوێ بۆ حەسانەوە بو نەك بۆ کردنە رەوشتێکی ئایینی .

## کردەوەی سێزدەم وەستان لە عارەفات

وەستان لە عارەفات لە لای هەمو زانایان فەرزە . ئەگەر حاجی لە کاتی خۆی لە عارەفات نە وەستا حەجی بەتالە . وە وەستان لە عارەفات بەمە پێك دێت کە لە عارەفات ئامادە بیت لە کاتی دیار کراو جا بە هەر جورێك بیت چ بە وەستان بیت بە دانیشتن یان پال کەوتن بە خەوتویی ما بە ئاگاداری بزانیت ئەمە عارەفاتە یان نەزانیت پاك بیت یان لەش پیس بیت یان بێ دەست نوێژ ژن حەیزدار بیت یا منال بو یان پاك وە دەشتی عەرەفات هەموی جێگەی وەستانە لە شێوی عەرەفە وەکاتی وەستان لە عارەفات لە لای حەنبەلی کاتی وەستان لە بەیانی رۆژی عالفە دەست پێ ئەکات وە لە بەیانی جێژنە کۆتایی دێت واتە ئەگەر کەسێك پاش بەیانی جێژنە گەیشتە عارەفات وەستانەکەی دروست نیە وە لە لای حەنەفیو شافیعی لە نیوەروی عالفە دەست پێ ئەکات وە بەیانی جێژنە کۆتایی دێت وە لە لای مالیکی کاتی لە پاش ئاوا بونی رۆژی عالفە دەست پێ ئەکات وە بەیانی جێژنە کۆتایێ دیت . جا هەر کەس لەو کاتەی بۆی دیار کراوە لە عارەفات ئامادە بیت وەستانەکەی تەواوەو حەجی دروستە .

( وه ستان ئه‌یاندنه شه‌و بۆ که‌سێك كه به‌رۆژ وه‌ستا بیـت )

که‌سێك له رۆژیی عالفه‌دا له کێوی عاره‌فات ئاماده بو له کاتی دیار کراو واجبه له سه‌ری تا رۆژ ئاوا ئه‌بیت له عاره‌فات بمێنی وه ئه‌گه‌ر پێش رۆژئاوا بون رویشت خوینێکی له سه‌ره جا ئه‌وه له حه‌نه‌فی‌و حه‌نبه‌لی‌و قسه‌یێکی شافیعی وایه ، به‌لام ئه‌گه‌ر پێش رۆژ ئاوا بون گه‌ڕاوه وه رۆژی له‌وێ ئاوا کرد خوینه‌که‌ی له سه‌ر لا ئه‌چیت له لای هه‌مویان جگه له زوفه‌ر له حه‌نه‌فیان وه له قسه‌ی به هیز تری شافیعی وه له لای أبن الحزم ئه‌گه‌ر رۆیشت هیچی له سه‌ر نیه چونکو مانه‌وه بۆ شه‌و سونه‌ته له لایان ، وه له لای مالکی کاتی وێستان له رۆژ ئاوای عالفه تاکو به‌یانی جێژنه‌یه ئه‌وه‌ی ویستانی نه‌که‌ویته ئه‌م کاته ویستانی به‌تاله وه حه‌جیشی به‌تال ئه‌بیت وه کۆ کردنه‌وه له به‌ینی رۆژی عالفه‌و شه‌وی جێژنه‌دا واجبه ئینجا ئه‌وه‌ی هیچ له رۆژی عالفه‌دا رانه‌ویستت خوینیکی له سه‌ره وه له لای گشتیان سونه‌ته که زۆر دوعا بکات چونکو دوعا له عارفات لای خوا گیریایه هه‌روا سونه‌ته که بچیته چیای ره‌حمه ( جبل الرحمـة )

( کۆتایی له باسی ئه‌وکه‌سه‌ی که ویستانی عارفاتی بۆ نه‌کرا )

له لای حه‌نه‌فی که‌سێك که ئیحرامی به حه‌ج به‌ست وه نه‌گه‌یشته عاره‌فات تاکو رۆژی جێژنه هه‌لات ئه‌وه وه‌ستانی عاره‌فاتی بۆ نه‌کرا وه هه‌ر که‌س وه‌ستانی نه‌بو حه‌جی به‌تال ئه‌بیت . جا ئه‌و که‌سه خود موختاره له به‌ینی دوو حال یه‌که‌م له ژێر ئیحرام بمێنی وه خۆی له هه‌مو قه‌ده‌غه‌کراویکی ئیحرام بپارێزێت تاکو سالی نو دێته‌وه وه حه‌جه‌که ته‌واو بکات .

دووەم :ـ کردەوەکانی عومرە بکات وە ئیحرام بشکینی وە لە سالی هاتو قەزای بکاتەوە وە هیچ خوینیش‌ی لە سەر نیـە • جا جیـاوازی نیـە حەجەکەی هی فەرز بیت یا حەجی سونەت بیت •

وە لە لای مالیکی دروستە لە ئیحرام بمێنـی تاکو سـالی هاتـو وە حەجەکە تەواو بکات بەلام ئەمە مەکروهە وە دروستیشە بیکات بە عەومرە وە عومرە تەواو بکات وە ئیحرام بشکیدی وە لە سالی هاتو قەزای بکاتەوە وە خوینیکیش لە سالی هاتو بدات نەك لەو سالەی کە وەستانی فەوتـاوە بەلام ئەگەر کردی بە عومرە ئەگەر لە کاتی خـۆی ئیحـرامی لە مەککـە دابەستبو ئەبی بچیتە دەرەوەی مەککە بە ئیحرامەوە وە لەوێوە بگەرێتەوە تەواف‌و سەعی‌و سەرتاشین بکات وە ئەگەر ئیحرامە کەی لە میقات بەست بۆ پێویستی چونە دەرەوەی نیە •وە جیاوازی نیە حەجەکەی فەرز بیـت یان سونەت وە لە لای حەنبەلی واجیبە بە عومرە تەواوی بکات وەلـــە سالی هاتو قەزای بکاتەوە ئەگەر حەجەکەی حەجی فەرز بیت وە لە خوین دوو قسەیان هەیە • یەکەم ئەیدات • دووەم ئەلێـت نایـدات وە ئەگـەر حەجەکەی سونەتە دوو قسەیان هەیە • یەکـەم : ئـەلێت ئـەبێ قـەزای بکاتەوە دووەم : ئەلێت پێویست نیە •

وە لە لای شافعی واجیبە کە بیکات بە عومرە وە پاش عومرە ئیحرام شکێنی وە ئەبێ خوینێکی وەکو خوێنی تەمەتـوع بـدات وە بـێ دوا خستن •

لە سالی هاتو قەزای بکات جا حەجەکەی واجیب بیت یان سونـەت حوکمی بەم جۆرەیە وە هەمویان ئەلێن فەوتانی وەستانەکەی بە عوزر بیت یان بێ عوزر بیت یەك حوکمە بەلام بێ عوزر گوناهی نیە •

## کردەوەی چواردەم

پێش خستنی نوێژی عەسر بۆ کاتی نیوەڕۆ لە عارەفات

ئەم پێش خستنە لای سێ پێشەوا سوننەتە وە لە لای ئیمامی حەنەفی چەند مەرجێك بۆ پێش خستن هەیە ئیستا نایێتە دی •

وە لە لای موحەممەدو ئەبویوسف ئەو مەرجانەی پێویست نیـە وە سوننەتـــە •

## کـردەوەی پـازدەم

دوا خستنی نوێژی شـیوان بۆ گەڵ عیشـا

ئەو دوا خستنە لای حەنەفی واجیبە بە جۆری ئەگەر لە کاتی خوی کردی ئەبێ لە موزدەلیفە قەزای بکاتەوە وە لـە لای سێ پێشـەوای تـر ئەویش سـوننەتـە •

## کردەوەی شازدەم

شەو کردنەوە لە موزدەلیفە

بۆ موزدەلیفە دوو شت هەیە •

یەکەم :ـ شەو مانەوە لە موزدەلیفە

دووەم :ـ وەستان لە لای مەشعەرالحەرام جا کاتی شـەو کردنـەوە لە نیوەی شەوی جێژنـە دەست پێ ئەکات وە بـە هـەلاتنی رۆژ کۆتایی دێت • وە کاتی وەسـتان بـە هەلاتنی بەیانی جێژنە دەست پێ ئەکاتەوە بە هەلاتنی رۆژ کوتایی دیت • جا باسی هەردوکیان ئەکەین •

لە لای حەنەفی وەسـتـان واجیبـە لە پـاش بەیانـی رۆژی جێژنـە ماوەیێکی کەم وە سوننەتە بمێنێ تەوە تاکو رۆژ هـەلات • جا کەسـێك ئەگەر پێش بەیانی وەستا وە رویشت وە نەگەراوە بـۆ وەسـتـانی پـاش بەیانی • ئەمە واجبیکی تەرك کردو خوینێکی لە سەرە • بەلام ئەگەر لە

بەر عوزرێك بیت وەك نەساغی یان سەرما واتە عوزرێكی لە لای خوا بیت ئەمە خوێنی لە سەر نیە وە ئەگەر عوزرە كە لە بەر خەلك بیت وەك قەلەبالغی ئەمە بە عوزر حیساب نیە • هەروا لە لای حەنەفی هەر واجبێك لە بەر عوزرێكی لە خواوە نەكرا قەیدی نیە وە عوزرێكی كە لە خەلكی بیت كار ناكات ، وە شەو كردنەوە لە لای حەنەفی سونەتە • جا باشتر بە لایانەوە ئەوەیە كە شەو لەوێ بیت تا نوێژی بەیانی لە كاتی تاریكی ئەكەیت پاشان بچیتە وەستان وە بوەستی تاكو نەختی پێش روژ هەلات وە وەستان بە ئامادە بون لەوێ پێك دیت بە هەر جۆرێك بیت •

وە لە لای مالیكی دابەزین بە ئەندازەی بار خستنێك واجبە ئەگەر نەیكات خوێنی لە سەرە •

بەلام شەو كردنەوە وەوەستان هەردویان سونەتن • وە لە لای شافیعیو حەنبەلی شەو كردنەوە واجبە وە وەستان سونەتە جا ئەگەر كەسێك شەوی نەكردەوە وە رویشت خوێنی لە سەرە وە یەكێك پێش نیوەشەو لەوێ بو وە روێشت بێ ئەوەی نیوەی تر بێت خوێنی لە سەرە چونكو لە كاتی خۆی شەوی نەكردوتەوە • ئەگەر گەراوە وە پاش نیوەی شەو نەختێ لەوێ بو خوینەكە لا ئەچیت • وە ماوەی شەو كردنەوە نەختێكە لە كات • وە لە لای گشتیان مانەوە تاكو نەختێ پێش رۆژ هەلاتن سونەتە تاكو هەر دوكیان بكات •

## كردەوەی هەفتەم

## رەجمی كوسپەی گەورە

ئەو كردەوەیە واجبە لە لای گشت پێشەوایان وە كاتی لە لای حەنەفی لە بەیانی بەردانی رۆژی جێژنە دەست پێ ئەكات كەواتە پێش بەیانی دروست نیە وە تاكو بەیانی رۆژی دووەمی جێژنە ئەخایەنیت وە سونەت وایە لە بەینی رۆژ هەلاتو نیوەرۆدا بیكات وە دواخستنی تارۆژ

ئاوا بونی رۆژی جێژنە دروستە وە تاکو بەیانی رۆژی دووەم مەکروهە وە هۆی فیدیە واجیب بونە لای ئیمام بەلام لای موحەممــەدو ئەبویوسـف واجیب ناکات •

وە لە لای شافیعی کاتی لە نیوەی شەوی جێژنە دەست پێ ئەکات وە سونئەتە دوای بخەیت بۆ دوای رۆژ هــەلات • وە کاتەکـە بە ئاوابـونی رۆژی جیژنە کوتایی دێت وە ئەگەر دوای خســت تا رۆژ ئـاوای رۆژی جێژنە بە قەزا گیرا ئەبیت بەلام خوێنی لە سەرە •

وە لە لای شافیعی کاتی لە نیوەی شەوی جێژنە دەست پێ ئەکات وە لە روژ ئاوابونی رۆژی چوارەمی جێژنە کوتایی دێت • وە لە لای حەنبەلی کاتی لە نیوەی شەوی جێژنە دەست پێ ئەکات وە ئەگەر دوای بخــات تاکو رۆژ ئاوابونی جێژنە دروستە ئەگــەر لەو کاتــەش دوای‌خست نابێ رەجم بکات تاکو نیوەرۆی رۆژی دووەمی جێژنە واتە لە لای ئەوان لــە رۆژەکانی دوای رۆژی جێژنە رەجم پێش نیوەرو دروست نیە بە قــەزاش بیـــت •

وە لە لای ئیبن‌الحەزم پاش رۆژ هەلاتی جێژنە کــاتی دەســت پــێ ئەکات وە تاکو کوتایێ مانگی ذی‌الحەجە ئەخایەنیت • وە ئەگەر کەسێك لەو ماوە رەجمی نەکرد یاخو پێش رەجم جیماعی کرد حەجی بەتالە چونکو لای ئەو رەجم لە کاتی خۆی فەرزە •

وە لە لای گشتیان واجیبە حەوت بەرد باوێیت وە سونئەتە یەك لــە دوای یەك بن وە لە گەل هەر بەردێك کە داویت بلی ( الله اکبر ) وە رەجم بە غەیری بەرد دروست نیە لە لای سێ پێشەواو ئیبن‌الحــەزم وە لــە لای حەنەفی بە هەر چی لەخاك بیت دروستە • وە لە لای هەمویان بە بەردی زۆر بچوك دروست‌نیە • وە بەهی گەورە مەکروهە • وە وا چاکە ئەوەندەی

دانەی خورما بیت • وە کەسێك نەیتوانی خۆی ڕەجم بکات لە بەر نەساغی یان پیری یان شەلی • یا یا یا •• هتد دروستە یەکێك بکاتە وەکیل ڕەجمی بۆ بکـات •

## کـردەوەی هـەژدەم

## سـەر بریـن

سەر برین واجیبە لە سەر کەسێك حەجی بە تەمە تنوع یان بە لێکـدان کردبێت وە لە سەر کەسی تر واجب نیە • جگە لەو کەسەی توشی حەرامێك بو بیت یان واجبێکی نە کردبیت •

## کـردەوەی نـۆزدەم

## سـەر تاشـین

لە لای شافیعی دوو قسەیە :ـ قسەی بە هێز تر ئـەوەیە کـە سـەر تاشین یا خۆ چەند مو لە سەر بڕین روکنە وە لە قسەی تر واجیبە وە کاتی لە نیوەی شەوی جیژنە دەست پێ ئەکات • وە سونەت وایە دوای ڕەجمی کۆسپەی گەورەی بخات وەتاکو مردن بە سـەر ناچێت بـەلاّم لە سـەر ئەوقسەی کە روکنە حاجی لە ئیحرام دەر ناچێت تاکو ئەو روکنە نەکات وە هەر چی روکن بێت تاکو جێ بە جێ نەکرێت مرۆ لە ئیحرام دەر ناچێت واتە نابێ دەخلی ژن بکات بەس •

وە بۆ پیاو سێ موبڕی بەسە بەلاّم تاشین خێر ترە وە ژن نابێ بتاشێت بەلکو چەند مووێك ئەبڕێت • وە لە لای مالیك ئەممە واجیبە وە کەسێـك دەست لەسەر نەدات تەیەتاشین‌نە بە موبرین حەجی دروستە بەلام خوێنێکی لە سەرە وە کاتی لە بەیانی ڕۆژی جیژنە دەست پێ ئەکات بەلام واجیبـە دوای ڕەجمی بخات وە کاتی ئەمێنێ تاکو ڕوژ ئاوای ڕۆژی چوارەمی جێژنە

ئەگەر لەو ماوە زۆر دوای خست خوینی لە سەرە وە ئەبێ ئەگەر بتـاشی هەمو سەری بتاشیت وە ئەگەر ببڕیت هەموی کورتبکات وە ژن هەمـو سەری بە ئەندازەی سەرە ئەنگوستێك واجیبە کورت بکات •

وە لە لای حەنەفی واجیبە وە کاتی پاش رەجمی کوسپەی گـەورەو سەر برین ئەگەر سەر برین لـە سەر بیـت • دەسـت پێ ئەکـات وەئـەبێ چوارێکی کورت بکات وە ژن بەس کورت کردنی لە سەرە • وە بۆ مروی بێ مو واجبە موس بە سەری خۆی دابخشێنی بەلام لـە لای ئەوانی تر سونەتە وە لای هەمویان گشت سـەر داگرتن بـە تاشین یا کورت کردن سو نـەتـە •

## گردەوەی بیستـەم

## تـەوافی ئیفاضـــە

تەوافی ایفاضە پاش گەرانەوە لە عارەفات لە لای هەمویان روکنـە وە شەتا نەکرێت حاجی لە ئیحرام دەرناچێت وە ئەبێ حەوت کەرەت سورِ بدات ئەگەر سورێکی کەم بو تەوافەکە بەتالە وە کە تەواف بەتال بـو حەجەکەش بەتالە مەگەر بگەرێتەوە حەوتەکە تەواو بکات بەلام لـە لای حەنەفی بەس چوار سوری روکنە سێ سورەکەی تری واجیبە ئەگەر نەیکرد حەجەکە دروستە بەلام خوینێکی لە سەرە •

وە کاتێ لە لای حەنەفی بە بەیانی بەردانی رۆژی جێژنە دەست پـێ ئەکات وە لە رۆژی جێژنـەدا خێر ترە وە کاتی تاکو مردن ئـەمینێ بـەلام مەکروهە لە چوار رۆژەی جێژنی دوا بخات وە ئەگەر بێ عوزر دوای خست خوێنی لە سـەرە •

وە لە لای شافیعی کاتی لە نیوەی شەوی جێژنـە دەست پێ ئـەکات وە تاکـو مـردن کـۆتایی نایێت وە باشترێن کاتی رۆژی جێژنـەیـە • وە

مەکروهە لە رۆژی جێژنە دوای بخات بێ عوزر • وە دواخستنی لە چوار رۆژەی جیژن ناپەسند ترە • وە ئەگەر تەوافی گەرانەوەی عارەفاتی نەکرد تەوافی دەرچونی بو بەر تەوافی گەرانەوە ئەکەویت • وە هەرکات تەوافی گەرانەوەی کرد ئەگەر سەعی لە پێشدا نە کردبو ئەبێ سەعیش بکات وە ئەگەر کردبوی بۆ ئەو حەجە پێویستی کردنەوەی ناکات • بەلام ئەگەر بیکاتەوە باشترە •

وە لە لای مالیکی کاتێ لە بەیانی رۆژی جێژنە دەست پێ ئەکات وە تاکو ئاخیری ذی الحەججە ئەمێنێ ئەگەر لە ذي الحەججە دوای خست خوینێکی لە سەرە وە ئەگەر نەیکرد لە ئیحرام ئەمینی وە حەجەکەی تەواو نابێت تاکو ئەیکات •

وە لە لای حەنبەلی کاتی لە نیوەی شەوی جێژنە دەست پێ ئەکات بەلام ئەبێ بیخاتە دوای رەجمی گەورەو سەر برین ئەگەر سەربرینی لە سەر بیت وە کۆتایی کاتی تا مردن نابیت • وە باشترین کاتی روژی جێژنەیە وەلە لای هەموو پێشەوایەك تاکو ئەم تەوافە نەکرێ حەج تەواونابیتو دەر چونی دوەمیش نابێت وەبە خوێن جەب ناکرێت وە ئەگەر یەك سوری مابو نابیت دەخلی ژن بکات تا سورەکە ئەکات • بەلام بەس لای حەنەفی بە چوار سور حەجەکە دروستە وە دەرچونی دووەم ئەبیت وە سێ سورەکەی تر بە خوین جەب ئەکریت هەروا لای هەمویان ئەم تەوافە تاکو وەستانی عارەفات تەواو نەبیت دروست نیە •

## ئاگادار کردنەوەیێك

لە پێش دا ووتمان کە بۆ حەج دو دەرچون هەنە جا چونکو ئەو دوو دەرچونە پەیوەندی بە رەجمو سەر تاشینو سەر برینو تەوافی گەرانەوە هەیە وا باشە لێرەدا باسی هەردو دەرچونت بۆ بکەم جا بزانە

که حاجی پاش شەو کردنەوەی موزدەلیفە سێ کردەوەی دێنە پێش رەجم وە سەر برین وە تەوافی گەرانەوە لە گەل سەعی بۆ کەسێك کە سەعی لە پێشدا نەکردیە وە سەرتاشین جا زانایان لە پێش خستن و دواخستن ئەو کردوانە هەر یەکە بریارێکی هەیە •

جا لە لای حەنەفی واجیبە کە سەر تاشین بکەویتە پاش رەجم بەلام تەواف دروستە پێش هەر دوکیان بکەویت یان پیش یەکیان بکەویت وە ئەگەر دوای هەردوکیان بخریت سونەتە • جا پاش رەجم دەرچونی یەکەم ئەبیت وە بە دەرچونی یەکەم هەموشت لەو شتانەی بەئیحرام قەدەغە کرابون تەرخان ئەبیت جگە لە ژن و خۆ بۆن خۆش کردن •

وە پاش سەر تاشین خۆ بۆن خۆش کردن تەرخان ئەبیت بەلام ژن ئەگەر حەلق پاش تەواف و سەعی بو ئەویش تەرخان ئەبیت ئەگەرنا تا تەواف و سەعی نەکات تەرخان نابیت وە کە ژن تەرخان بو ئەمە دەرچونی دووەمە • وە هیچ قەدەغە نامینی •

وە لە لای مالیکی پاش وەستانی موزدەلیفە چوارشت هەیە •

١ ـ رەجم

٢ ـ سەر برین ئەگەر لە سەرت بیت •

٣ ـ سەر تاشین •

٤ ـ تەوافی گەرانەوە لە عارەفات •

جا پیش خستنی رەجم لە سەر تاشین و تەواف واجیبە وە لە سەر سەربرین سونەتە وە پێش خستنی سەر بەرین نە سەر تاشین و تەواف سونەتە وە پێش خستنی تاشین لەسەر تەواف باشە جا دەرچونی یەکەم بەرجم ئەبێ یاخۆ بە کوتایی کاتی • وە بە دەرچونی یەکەم هەمو شت تەرخان ئەبیت جگە لە ژن و نێچیر •

وە دەخل کردنیان هۆی واجیب بونی خوێنێکە بەلام بۆن خۆش کردن مەکروهە وە بە کردنی خوێن واجیب نابیت • وە دەرچونی دووەم پاش تەواف و سەعی ئەبیت ئەگەر سەعی نەکردبیت ئەگەرنا پاش تەواف • وە

بەوەی هەموشت تەرخان ئەبیت وە هیچ قەدەغە نامینی وە لە لای شافیعی کردنی ئەو کردەوانە بەم جۆرە سونەتە رەجم پاشان سەربڕین ئەگەر لـە سەریەتی • پاشان سەرتاشین پاشان تەواف لە گەل سەعی ئەگەر سەعی لە پێشدا نەکردبو جا ئەگەر ئەوانەی پێش‌و پاش خستن دروستە وە زیانی نیـە جگە لە فەوتانی خێری سونەتت جا دەرچونی یەکەم بە کردنی دوو لەو سێ شتاتە ئەبیت • واتە ئەگەر رەجم‌و تاشینی کرد یا خو تاشین‌و تەوافـی کرد یارەجم‌و تەوافی کرد دەرچونی یەکەمی بۆ ئەبیت بەلام سەعی لە پاش تەوافە وە هەر کات دەرچونی یەکەم بۆ هەمو شت تەرخان ئەبیت جگە لە ژن وە دەرچونی دووەم پاش بە جی هینانی هەمو روکنان ئەبێت وە بەوەی ژنیش تەرخان ئەبیت •

وە لە لای حەنبەلی ئەو رێژە لە بەینی ئەو کردەوانـە سونەتـە وە دەرچونی یەکەم پاش رەجم‌و تاشین ئەبیت وە دەرچونی دووەم بە تەواو کردنی هەمو روکنان ئەبیت • وە بە دەرچونی یەکەم جگە لە ژن تەرخانە وە بە دووەم ژنیش تەرخاتە •

## کردەوەی بیست‌و یەکەم
## شـەو کردنـەوە لە مینا

لە لای حەنەفی لە پاش شەوی جێژنە سێ شەو یان دوو شەو سونەتە حاجی لە مینا شەو بکاتەوە وە ئەگەر هیچ شەو نەکاتەوە هیچی لە سـەر نیە جگە لەوە کە خێری سونەتی نا نوسرێت جا شەو لە هەر جێگابیت بە رۆژ بیت‌و رەجمی خـۆی بکـات‌و بگەرێتـەوە تـەواوە • وە لـە لای ابن الحزم وەك حەنەفی وایە •

وە لە لای مالیکی واجبە لەسەر حاجی پاش شەوی جێژنە سێ شەو یان دوو شەو لە مینا بمینیتەوە ئەگەر بەس یەك شەو ماوە خوێنیکی تەواوی لە سەرە جا کە دوو شەو مـاوە وە پێش رۆژ ئاوابونـی رۆژی سێیەمـی

جێژنه دەرچو له مینا ئەگەر خەلکی مەککه بیت شـەو مانـەوەی شـەوی چوارەمی جێژنی له سەر لائەچیت هەروا رەجمی رۆژی چوارەمی جێژنەش له سەری لائەچیت وه ئەگەر رۆژ ئاوابو دروست نیه دەر بچیت وه ئەبێ شەوی چوارمی جێژنەش لەوێ بێت وه رەجمی رۆژی چوارەمیش بکات وه ئەنەر دانیشتوی مەککه نیه به دوو مەوج ئـەتوانـێ رۆژی سێیەمـی جێژنه له مینا دەربچیت • یەکەم پێش رۆژ ئـاوا دەر بچیـت دووەم پێش رۆژ ئاوا نیەتی دەرچون بینی جا بەم دوو جۆره مانەوەی شەوی چوارەم و رەجمی رۆژی چوارەمی جێژنەی له سەر لائەچیت • گەر شەوی چوارەم له مینا نەمێنی وه ئەگەر دەرنەچو وه نییەتیشی نه هینا که رۆژ ئاوا بۆ ئەبێ شەو بمینی وەرەجمی رۆژی چوارەمیش بکات وه لەلای شافیعی دوو قسه هـەیـه :

یەکەم :ـ ئەلێت مانەوەی سێ شەو یان دوو شەو له مینا واجیبه وه کەسێك هێچ شەو نەماوه له مینا خوینێکی تەواوی له سەره وەئەگەر یەك شەو ماوه مستێکی تەعام له بری شەوی دووەم ئەدا وه یەکێکی تر ئەلێـت درهەمێك ئەدات وه یەکێ تر ئەلێت سێیەکی خوێن ئەبێ بدات • بـەلام ئەگەر پێش رۆژ ئاوا بونی رژۆی سێیەمی جێژنه دەرچو مانەوەی شەوی چوارەمی جێژنەو رەجمی رۆژی چوارەمی له سەر لائحەچیـت وه ئەگـەر رۆژ ئاوابو دەرنەچو دەرچونی دروست نیه ئەبێ شەو بمینی وه رەجمـــی روژیش بکـــات •

دووەم قسه له شافیعی ئەو شەو مانەوه سونەته ئەگەر کەسێك هیچ شەو نەماوه هیچی له سـەر نیـه •

وه له لای حەنبەلی دوو قسەیه یەکەم ئەلێـت سونەتـه • وه دووەم ئەلێ واجیبه وه قسەی یەکەم له لایان پەسند تره •

وه کەسێك شەو له مینا نەماوه هیچی له سەر نیه له لای حەنبەلیان •

## کردمەی بیستو دووەم

## رەجمی سێ رۆژەی پاش جێژنـە

هەمو پیشەوایەکان یەك قسەن کە رەجمی هەرسێ کوسـیە لە سـێ رۆژەی پاش جێژنەدا یان دوو رۆژ واجیبە • وە سێ روژە تـەواو کـردن خێر ترە • بەلام لە هەندێ شت بریاریـان جیـاوازە جا لـە لای حەنـەفی رەجم کردنی هەر سێ کوسپە بە بیستویەك بەرد هەر یەکەی حەوت بەرد واجیبە لە هەر سێ رۆژی پاش جێژنەدا بەلام ئەگەر پێش بەیانـی رۆژی سێیەم بگەرێتەوە رەجمی ئەو رۆژەی لە سەر لائەچیت •

وە لە پێشدا رەجمی کوسپەی بچوك ئەکات وە بچـوك ئەوەیەکـە کەوتوتە لای مزگەوتی خیف پاشان هێ ناوەندێ رەجم ئەکات • پاشـان هێ گەورە جا ئەو جورە رێزە سونەتە لە لایان ئەگەر بە پێچەوانەی کرد •

واتە لە گەورە پێدا هات یا خو ناوەندی کرد پاشان گەورە پاشـان بچوك یا ناوەند پاشان گەورە پاشان بچوك هیچ زیانی نیە جگە لە فەوتانێ خێری سونەت نەبیت وە رەجمی دروستە بەلام سونەتە بە رێـز دوپاتـی بکاتەوە •

وە کاتی رەجم لە رۆژی یەکەمو دووەم لە پاش نیوەرو دەست پـێ ئەکات وەتاروژ حەل دێت ئەمینی وە لە رۆژی سێیەم لە بەیانی تاکـو رۆژ ئاوابونە بەس • جا ئەگەر رەجمی رۆژی یەکەمی نەکرد لە شەوی دووەم بە ئەدا ئەیکات وە ئەگەر شەویش نەیکـرد رۆژی سێیـەم ئەیکـات بـە قەزاوە وەجەزائێك ئەدات •

هەروا ئەگەر رەجمی رۆژی دووەمی نە کـرد لە شـەوی چـوارەم ئەیکات بە ئەدا گەر نەیکرد رۆژی چوارەم بە قەزا ئەیکات وە جەزا ئەدات وە ئەگەر هەموی دووا خستن تاکو رۆژی چـوارەم ئاوابو رەجمی بـۆ

دروست نیه وەئەبێ خوێن بدات • وە ئەبێ رەجم بە فڕیدان بیت بە لە ناو داتان دروست نیه وە ئەبێ بۆ هەر کوسپەیێك حەوت بەرد باوێت ئەگەر بەردێکی یا دووی کەم کرد نیو ڕبە تەعام ئەبی ببەخشیت • وە ئەبێ هەموی بکەونە ناو چالەکەی ئەوەی نەکەویتە ناوی حیساب نیه • وە سونتەتە لە هەمو بەرد فڕێداتێك بلێ بسم الله اکبر وە پاش تەواو بونی رەجمی هەر کوسپەیێك بەرەو قیبلە رابوەستێ وە دەست بەرز بکات وە دوعا بۆ خۆی موسلمانان بکات • وە سونتەتـە کـە ماوە نەخاتـە بەینـی بەردەکـانو رەجمـەکـان •

وە لە لای مالیکی حاجی ئەبێ هەمو روژێـك لە سـێ رۆژەی پـاش رۆژی جێژنە رەجمی هەرسێ کوسپە بکات وە هەر یەکە حـەوت بـەردی باوێتی وە ئەگەر بەس دوو رۆژی کرد زیانی نیه وە کـاتێ رەجـم هەمـو روژێك لە نیوەرۆ دەست پێ ئەکات وە بە ئاوابـونی رۆژ کۆتـایی دێـت ئەگەر رەجمی هەر روژێکی دوا خست یا یەك بەردیش دوا بخات ئەبێ قەزای بکاتەوە وە خوێنێکیش بدات وە مەرجە کە رەجم بە بەرد بیت وە بەردەکان بکەونە ناو چالەکان وە لادان لە ڕێز دروست نیه • وە سونتەتە کە یەك لە دوای یەك بێ ماوە نەخاتە بەینی بەردەکانو ڕەجمەکـان وە لە پـاش دوو رەجمێ پێش بەرەو قیبلە رابوەستێو دوعا بکات •

وە لە لای شافیعیو حەنبەلی ئەبێ سێ رۆژ یـان دوو رۆژ لە دوای رۆژی جێژنە هەموو روژێك هەر سێ کوسپە رەجم بکـات وە هـەر یەکـە حەوت بەردی باوێتێ وەلە بچوك دەست پێ بکات وەلـە گـەورە کوتایی پێ بینێ ئەگەر ئەم ڕێزەی گۆری دروست نیه • وە ئەبێ هەمویان بکەونە چالەکان • وە ئەبێ بە فڕێدان بیت نەك بە داتان • وە کاتی رەجم هەمـــو روژێك لە نیوەرۆ دەست پێ ئەکات وە لە رۆژی چوارەمی جێژنە کوتایی دێت کەوابێت ئەگەر رەجمی هەمو روژەکانی لە رۆژی چـوارەم داکـرد

دروسته به مەرجێ ڕێزی ڕوژەکان ڕاگریت بۆ ڕۆژی یەکەم هەرسێك بە ڕێز بکات پاشان بۆ دووەم پاشان بۆ سێیەم وە ئەگەر لە سێ ڕۆژەی دوای جێژنەی دواخست خوێنی لە سەرە • وە ماوە نەخستنە بەینی بەردەکانو ڕەجمەکان سونەتە وە ئەگەر بەردێك یان دووی کەم بو زیانی نیە لای حەنبەلی وە لە لای شافیعی خیرێك ئەبێ بکات لە ڕێبازی شافیعیدا ئیمامی رافعیو ئیمامی حەرەمەین فتوایان داوە کە ڕەجم لە هەمو ڕۆژێکدا لە پێش نیوەڕۆش دروستە وە شێخی ئەسنەویش ئەم فتوایەی پەسند کردووە • جا بۆ حاجی دروستە لە پێش نیوەرودا ڕەجم بکات بە تەقلیدی ئەو ئیمامانە چونکو پاش نیوەڕۆ زۆر زەحمەتو قەلە بالغ ئەبێت •

## کردەوەی بیستو سێیەم

## تەوافی دەرچون لە مەککە

لە لای حەنەفی تەوافی دەرچونی لە مەککە واجیبە واتە کە حاجی حەجی تەواو کرد وە ویستی بۆ مال بگەڕێتەوە واجیبە بچیت تەوافی کەعبە بکات وە حەوت جار بە دەوری دا سور بخوات وە پاشان دوو ڕەکەعەت سونەتی تەواف ئەکات وە ئەگەر گەراوە بەبێ تەواف واجیبە بگەڕێتەوە تەوافەکە بکات ئەگەر نەگەراوە تاکو گەیشتەوە میقات هەینێ خودموختارە لە بەینی گەرانەوەو لە بەینی سەر بڕینی حەیوانێك وە ئەگەر گەرانەوەی پەسند کرد ئەبێ ئیحرام بۆ عومرە ببەستێ وە بگەڕێتەوە عومرە بکات جا پاشان تەوافی دەرچون بکاتەوە وە لە لای مالیکی ئەم طە وافە سونەتە • وە مرو پاش تەواف ئەبێ گورج لە مەککە دەربچیت ئەگەر بۆ بار بارکرنو نوێژ مایەوە قەیدی نیە وە زێدە لەوە بێ عوزر بمێنی ئەبێ دوپاتی بکاتەوە وە ئەگەر تەوافی ئیفاضەی کەوتە دوایێ وە بە نیەتی تەوافی ئیفاصەو دەرچون یەك تەوافی کرد دروستە بە مەرجێ گورج

دەربچیت هەروا ئەگەر تەوافی عومرەی بۆ هەردو کرد دروستە وە ئەگەر بێ تەوافی دەرچون دەرچو سوننەتە بۆی بگەرێتەوە ئەگەر عوزری نەبیت وە لەلای شافیعی دووقسەیە یەکەم ئەلێ واجیبە دووەم ئەلێ سوننەتە ٠ وە لە سەر قسەی واجیب لە سەر حەیزدارو خوێنی منال بون واجیب نیە وە ئەگەر بێ عوزر پاش تەواف ماوە لە مەککە ئەبێ دوو پاتی بکاتەوە بەلام بە ئەندازەی بار رێکخستنو بار کردنو نوێژ کردنی قەیدی نیە وە لە لای حەنبەلی واجیبە ٠ وە بو ئەوەی کە تەوافی ئیفاضە یان عومرە بەر هەردوکی بکەویت دوو قسەیە وە ئەگەر پاش تەواف گیر ببیت ئەبێ دووپاتی بکاتەوە ٠ وە هەرکەس بێ تەواف دەر بچیت ئەگەر نێزیك بووە عوزری نەبۆ ئەبێ بگەریتەوە ئەگەر نا خوێنێك ئەبێ بنیریت ٠

تێ بینی :ــ

ئەو بیستو سێ کردەوانەی ووتران هەمویان یەك جۆرنین بەلکو هەندێك روکنن واتە فەرزن وە هەندێك واجبن وە هەندێك سوننەتن جا ئەو جەدوەلەت پێش کەش ئەکەم بۆ ئەوەی بە ئاسانی حوکمی هەر کردەوەیێك بزانیت لە سەر بریاری پێنج پێشەوا جا تکایە زۆر ئاگاداری ئەم جەدوەلە بێت چونکو زۆر پوختو بەکەلکو سودە ٠ جا پاشان حوکمی ئەو کەسەت بۆ باس ئەکەم کە یەکێك لەو کردەوانە تەرك ئەکات ٠

| دەوە | حەنەفی | مالیکی | شافیعی | حەنبەلی | ئیبن حەزم |
|---|---|---|---|---|---|
| خوپاك كردن بە موبرین و نینوك كردن | سونەتە | سونەتە | سونەتە | سونەتە | سونەتە |
| خوشوشتن | سونەتە | سونەتە | سونەتە | سونەتە | سونەتە |
| خو بون خوشكردن | سونەتە | مەكروهە ئەگەر بونی بمێنێ | سونەتە | سونەتە | سونەتە |
| دوو رەكەعەت پێش ئیحرام | سونەتە | سونەتە | سونەتە | سونەتە | سونەتە |
| ئیحرام | مەرج | روكن | روكن | روكن | فەرز |
| گوتنی لبیك هتد | ئەو یاخود یەكێكی تر واجیبە | واجیبە وەپی ماوەخستنە بەین | سونەت | سونەت | فەرز |
| بونی ئیحرام لە میقات | واجیب | واجیب | واجیب | واجیب | فەرز |
| تەواف گەیشتنە مەككە | واجیب | واجیب | سونەت | سونەت | فەرز |
| دوو رەكعەتی پاش تەواف | واجیب | دوو قسەیە واجیب سونەت | سونەت | سونەت | سونەت |
| سەعی | واجیب | روكن | روكن | سێ قسەیە روكن واجیب سونەت | فەرز |
| شەوی عالەفە لە مینا بون | سونەت | سونەت | سونەت | سونەت | سونەت |
| وەستان لە عارفات | روكن | روكن | روكن | روكن | فەرز |
| نوێژی عەسر هێنانە گەڵ نیوەرو | خیلاف لە دروست بونی هەیە | سونەت | سونەت | سونەت | سونەت |
| شەوكردنەوە لە موزدەلیفە | سونەتە | دابەزین بە قەد جارخستن واجیبە | دوو قسەیە /واجیب /سونەت | واجیب | سونەت |
| وەستان لای مەشعەری حەرام | واجیب | سونەت | سونەت | سونەت | واجیب |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ڕەجمی کوسپەی گەورە | واجب | واجیب | واجیب | واجیب | فەرز |
| سەربرین | بوتە مەتوع لیکراں واجب | بوتەمەنوع لیکراں واجیب | بوتەمەتوع ولیکران واجیب | بوتەمەتوع ولیکران واجیب | واجیب |
| سەرتاشین یان کورت کردن | واجیب | واجیب | دووقسەیە واجیب روکن | واجیب | سونەت |
| تەواو گەرانەوە لە عارەفات | روکن | روکن | روکن | روکن | فەرز |
| سێ شەو یان دوو شەو مانەوە لە مینا | سونەت | واجیب | دووقسەیە واجیب سونەت | دووقسەیە واجیب سونەت | سونەت |
| ڕەجمی ڕوژان پاش جەژنە | واجب | واجیب | واجیب | واجیب | فەرز |
| تەواف دەرچوون لە مەککە | واجیب | سونەتە | دووقسەیە واجیب سونەت | واجیب | فەرز |

**ئاگا دارییەك**

هەر کەس کردەوەیێك لەو بیست و سێ کردەوانە نەکات تەماشا ئەکەین ئەگەر تەرك کراو ئیحرامە یاخو وەستانی عارەفاتە ئەوە لە سەر هەمو ریبازییك وە لە لای هەمو پێشەوایان حەجەکەی بەتالە ۰ وە ئەگەر کردەوەکە جگە لە ئیحرام وەێستانە دیسان تەماشائەکرێ ئەگەر کردەوەکە سونەتە هیچ زیانی نیە لەسەر قسەی ئەو پێشەوایە کە ئەفەرمویت سونەتە وە ئەگەر کردەوەکە واجیبە ئەمە بە نەکردنی حەج بەتال نابیت بەلکو حەجەکە دروستە وە لە بری واجیبەکە ئەبێ خوینێك بدات لە لای ئەو زانایە کە ئەفەرموێت ئەم کردەوە واجیبە وە ئەگەر کردەوە کە فەرزە یان روکنە ئەوە تاکو ئەو کردەوە نەکرێت

حەجەکە تەواو نابێت وە حاجیّ لە ئیحرام دەرناچێت تاکو ئەو روکنە ئەکات وە هەمویان یەك قسەن لە مە کە خوێنی واجیب وەکو خوێنی تەمەتتو ع ولێکدان وایە واتە ئەبیّ مەڕرێك یان بزنێك سەر ببرێت وە ئەگەر نەیتوانی دە روژو ئەگریت • وە هەمویان یەك قسەن کە ئەبیّ کوشتنەوە لە حەرەم بێت وە سێیان فتوایان داوە کە بۆ خاوەنی دروست نیە لە گوشتی فیدیەی واجیب بخوات وە مالیکی ئەلین ئەویش وەکو فیدیەی تەمەتتوع و لێکدان دروستە خاوەنی لیّ ی بخوات • وە ئەگەر رۆژو ئەگریت لە هەر جێگایێك ئەگریت وە کەی ئەگریت کەیفی خویەتی •

## تیبینی

لە لای حەنەفی هەر واجیبێك بە عوزر تەرك بکرێت هیچ زیانی نیە بە مەرجێك عوزرەکە لە خواوە بیت وەك نەخوشیو سەرماو گەرما وە ئەگەر لە خەلکەوە بێت وەك قەلەبالغی ئەمە لیّ بوراو نیە •

## باسی سێهەم لە چونیەتی عومرەدا

لە لای شافیعیو حەنبەلی عومرەش وەکو حەج فەرزە لە سەر هەمو موسلماتێك چ ژن چ پیاو لە ماوەی ژیانیدا یەك جار وە مەرجی فەرزبونی عومرەش وەك مەرجی فەرز بونی حەج وایە •

وە لە لای مالیکیو حەنەفی عومرە سونەتێکی زۆر بە خێرە وە واجیب نیە •

## کردەوەکانی عومرە

لە لای شافیعی روکنی عومرە پێنجن یەکەم ئیحرام دووەم تەواف سێیەم سەعی چوارەم سەرتاشین یان کورت کردن پێنجەم ئەم • رێزە پێش خستنو پاش خستن دروست نیە •

وه له لای حه‌نبه‌لی‌و مالیکی ئیحرام‌و ته‌واف‌و سه‌عی روکنن وه سه‌رتاشین یان کورت کردن واجیبه وه له لای حه‌نه‌فی ئیحرام مه‌رجه وه چوار سور له ته‌واف روکنن وه سێ سوری تر واجبن وه سه‌عی‌و سه‌رتاشین واجیبن عومره هه‌مو کاتێك له سال دا کاتی عومره‌یه جگه له‌و رۆژانه‌ی که حاجی خه‌ریکی کردموه‌کانی حه‌جه وه جێگه‌ی ئیحرام به عومره واته ( میقات ) بۆ خه‌لکی مه‌ککه یا خو ئه‌و که‌سانه‌ی که له مه‌ککه دانیشتون به میوانی وه ئه‌یانه‌وێت عومره بکه‌ن ئه‌وه‌یه ئه‌بێ بچیته ده‌ره‌وه‌ی حه‌ره‌م وه له‌وێ ئیحرام به عومره ببه‌ستی وه زۆر جێگه هه‌نه له ده‌ره‌وه‌ی حه‌ره‌م بۆ ئیحرام به‌ستن به‌لام له هه‌مویان به خێر تر مزگه‌وتی حه‌زره‌تی عائشه‌یه ره‌زای خوای لێ بیت ٠ وه ئه‌وانه‌ی له ده‌ره‌وه بۆ مه‌ککه ئه‌چن بۆ عومره یا بۆ حه‌ج به ته‌مه‌تتوع ئه‌که‌ن ئه‌وانه له میقاتی حه‌ج ئه‌بێ ئیحرام به‌عومره ببه‌ستن وه واجباتو مه‌رجو سوننه‌ته‌کانی عومره‌ش وه‌ك واجبات‌و مه‌رج‌و سوننه‌تی حه‌جن وه ئه‌وه‌ی له کاتی ئیحرام به حه‌ج قه‌ده‌غه‌نه له کاتی ئیحرام به عومره‌ش قه‌ده‌غه‌ن وه له لای سێ پێشه‌وا له سالێکدا هه‌ر چه‌ند عومره ئه‌که‌یت باشه‌و خێره‌و سوننه‌ته وه له لای مالیك له سالێ یه‌ك عومره سوننه‌ته وه زێده کردنی مه‌کروهه وه له لای هه‌مویان حه‌ج له سالێکدا به‌س یه‌ك جار دروسته ٠

### « کۆتایی له باسی چونه مه‌دینه‌ی پیرۆز »

ئه‌ی برای حاجی له چونت بۆ حه‌ج یان له گه‌رانه‌وه‌ت بچمو بۆ مه‌دینه‌ی پیروز شاری خوشه‌ویستی خواو گه‌وره‌تری هه‌مو بونه‌وه‌رێك حه‌زره‌تی موحه‌ممه‌د درودی خوای له سه‌ر بیت بۆ ئه‌م شتانه یه‌که‌م زیاره‌تی مزگه‌وتی پیروزی‌و چه‌ند نوێژ تێدا کردنی چونکو حه‌زره‌ت درودی خوای لێ بیت فه‌رمویه‌تی که نوێژێك له مزگه‌وتی ئه‌ودا خێری هه‌زار نوێژی له جێگه‌ی تر هه‌یه جگه له مزگه‌وتی حه‌رام دووه‌م بۆ

ئەوەی کە زیارەتی قەبری پیروزی بکەی چونکو حەزرەت فەرمویە هەر کەس زیارەتی قەبرم بکات پاش مردنم وەك ئەوەیە کە زیارەتم بکات لە کاتی ژینم وە فەرمویەتی هەر کەس زیارەتی قەبرم بکات ٠ شەفاعەتی منی بۆ واجیب ئەبیت وە فەرمویەتی هەر کەس لە لای قەبرم سەلام لە من بکات خوا روحم ئەگێریتەوە بەر بەدەنم ٠ تاکو وەلامی سەلامی ئەدەمەوە٠ وە لە شێخی عوتبی ئەگێرنەوە کە فەرمویەتی لە خزمەت قەبری پێغەمبەر دانیشتبوم دیتم ئەعرابیێك هات ووتی (السلام علیك یا رسول الله) لە قورئاندا بیستومە کە خوا ئەفەرمویت ( ولو انهم اذ ظلموا جاءوك فاستغفروا الله واستغفر لهم الرسول لوجدوا الله توابا رحیما ٠ ) واتە ئەگەر ئەوانە لەو کاتەی کە گوناهیان کرد هاتبانە لات وە داوای لێ خوشبونیان لە خوا کردبایە وە پێغەمبەریش داوای لێ خوشبونی بۆ کردبانە ئەیاندیت خوا توبە وەرگرەو بەرحمە ٠ جا وامن هاتم داوای لێ خوشبونی گوناهم لە خوا ئەکەم وە تۆش ئەکەم بە شەفاعەت کار پاشان چەند شیعری خویندنەوە وە من واتەکانم نوسین ئەی چاترین کەس لە خاك نێژراوە ئیسكو لەشی لە بونی خوشی ئیتر بۆن خوش بو گشت دەشتو دەر گیانم فیدایی قەبرێ کە تۆ تیا خەوتووی چاکەو سەخاوو پاکی لەوێ خەوتونە یەك سەر شەفاعەت کارمان تۆی شەفاعەتت رەوایە کاتی کە پێمان لە جادە زەلی لە بۆ رێ سەقەر دوو یاری تۆ بو ئەبوبەکرو عومەر لە بیر ناکرێن هەر دەم سەلامیان لە سەر تاکو دونیا ئەچێتە سەر جا پاشان ئەعرابیە کە رۆیشت وە من خەوم لێ کەوت وە پێغەمبەرم لە خەودا دیت فەرموی ئەی عوتبی بگە ئەعرابیەکە وە موژدەی پێ بدە کە خوالێی خۆشبو وە باش وایە مرو کە بۆ زیارەتی مزگەوتی حەزرەت ئەچێت هەمیشە لە رێگە سەلاوات لێ بدات وە پێش چونە ناو مزگەوت خۆی بشوات وە جلی جوان لە بەر کات وە کە گەیشتە دەرگای مزگەوت پای راستە پێشان بخاتە ژوری مزگەوت وە بلێت :ـ أعوذ بالله العظیم وبوجهه الکریم وسلطانه القدیم

من الشيطان الرجيم • بسم الله الرحمن الرحيم والحمد لله • اللهم صلّ على محمد وعلى آل محمد اللهم اغفر لي ذنبي وافتح لي ابواب رحمتك • وه كه هاته دەر پای چەپە پێشان ئەخاته دەرەوه وه ئەو دوعایه ئەخوێنی • بەلام له جیاتی ( أبواب رحمتك ) ئەڵێت ابواب فضلك جا ئەو دوعایه بۆ چونــو هاتنه دەری هەمو مزگەوتێك سونەتە • وه كه چووه ناو مزگــەوت دوو رەكەعەت سونەتی چونه مزگەوت ئەكات پاشان بۆ لای ( روضەی )پیرۆز ئەچیت كه له بەینی مینبەرو قەبــری حەزرەته وه لــەوێ ئەمینــی وه نوێژ ئەكات چەندی ئەتوانیت وه له خوا ئەپاڕێتەوه وه چاكەی دونیاو قیامەت له خوا داوا ئكات • چونكو حەزرەت فەرمویه مابەینی ماڵو مینبەری مــن باغێكه له باغی بەهەشت • پاشان پشت له قیبله ئەكات • وه رو له قەبــری پیروزی ئەكات وه له پاش پەنجەره رائەوەستیت زۆر به ئەدەبــو حەیا وه به دەنگێكی كزونەرم ئەڵێت ( السلام عليك ايها النبي ورحمة الله وبركاته السلام عليك يانبيّ الله وخيرته من خلقه اشهــد ان لااالــه الا الله وحــده لا شريــك له واشــهد انّ محمدا عبــده ورسوله • أشــهد انك قد بلغــت رسالات ربّك ونصحت لأمتك ودعوت الى سبيل ربّك بالحكمة والموعظة الحسنة وعبدت الله حتى أتاك اليقين فصلى الله عليك كثيرا كما يحبّ ويرضى اللهم اجز عنّا نبينا افضل ما جزيت احدا من النبين والمرسلين وابعثه المقام المحمود الذى وعدته يغبطه به الاولون والاخرون اللهم صل على محمــــد وعلى آل محمد كما صليت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم وبارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم انك حميدٌ مجيده اللهم انك قلت وقولك الحق ( ولوأنهم اذ ظلموا أنفسهم جاءوك فاستغفروا الله واستغفر لهم الرسول لوجدوا الله تواباً رحيما) • وقد أتيتــك يارســول الله مستغفرا من ذنوبى مستشفعا بك الى ربى فأسألك يا ربّى أن توجب لى المغفره كما أوجبت لمن أتاه فى حياته اللهم اجعله أول الشافعين وأنجــح السائلين وأكرم الاولين والاخرين برحمتك يا أرحم الراحمين )

پاشان چەندی ئەتوانی دوعا بۆ خـۆیوو بۆ موسلمـانان وەدایـكو باوكیو كەسو كاری ئەكات ٠ پاشان بۆ لای قەبـری حـەزرەتی ئـەبو بەكرو عومەر ئەچیت وە ئەڵێت السلام علیك یا ابا بكر الصدیق السـلام علیك یا عمر الفاروق السلام علیكما یا صاحبی رسول الله (ص) ووزیریە فی حیاته السلام علیكما ورحمـة الله وبركـاته اللهم اجزهمـا عن نبیك وعـن الاسلام خیرا سلام علیكم بماصبرتم فنعم عقب الدار اللهم لاتجعله آخـر العهد من قبر نبیك ومن حرم مسجدك یا أرحم الراحمیـن ) ٠ وە ئـەوەی نەتوانی ئەم دوعایە بخوێنی با كەمێكی بخوێنی وە لای كەم ئەوەیە كە بلێ السلام علیك یارسول الله وە سەلاواتی لێ بدات وە ئەوەی نەتوانی با بۆ خۆی بە زوبانی خۆی سەلام لە حەزرەتو حەزرەتی ئەبوبەكرو عومـەر بكات وە بە زوبانی خۆی بپارێتەوە دوعا بكات وە داوای چاكەی دونیاو قیامەت لە خوا بكات جا لە كوتاییدا چەند شتێك هەنە ئیمامی نەوەوی لە لە كتێبی ئیضاحدا فەرمویە بۆتان ئەنوسم چونكو سودێكی زۆریان هەیە بەباش وەریان بگرە ٠

یەكەم : ئەوەیە ئەفرمویت نابی مرۆ بـە دەوری قەبـری حەزرەتـدا سور بخوات وە یان زگی یان پشتی یان سینـەی بـە دیـواری قەبـرەوە بنوسینی وە دەست لێدانو ماچكردن ئەمە هەموی بۆ قەبری حەزرەتو بۆ هەمو قەبرێك بێ شەرعینە وە ئەبێ خەڵك لەم جۆرە شتانە قەدەغە بكرێـن وە تێ بگەیاندرێن چونكو ئەو شتانە هەموی پێشەی بوت پەرستانە وە شەرع پێ نارازیە ٠

دووەم : ئەفرمویت مرۆ ماوەی مانەوەی لە مەدینە پێویستە هەمـو نوێژەكانی لە مزگەوتی حەزرەت بكات ٠ وە كە چووە ناو مزگەوت نیەتی ئیعتكاف بینی جا نیەتی ئیعتـكاف بۆ هەمو مزگەوتێك سوننەتو خێرە وە كە ئەو نیەتی هینا هەر چەنـد لە مزگـەوت مایـەوە بـە عیبـادەت بـۆت ئەنـوسرێـت ٠

سێیەم : ئەفرمویت باش وایە هەمو رۆژ بچیتە گورستانی بەقیع پاش سەلام کردن لە پێغەمبەر ٠ بە تایبەتی لە رۆژی جومعە دا وە کە گە یشتیە بەقیع بلێ سەلامی خواتان لێ بیت ئەی گەلی ئیمانداران ٠ وە ئێمەش خوا حەزکات ئەگەینەوە ئیوە ٠ خوایە لە ئەهلی بەقیع خوشبە ٠ خوایە لە ئێمەو ئەوان خوشبە ٠ وەزیارەتی قەبرەکان ئەکات ٠ وەك قەبری ئیبراهیم کوری حەزرەت ٠ وە هی حەزرەتی عوسمانو ٠ ئیمامی حەسەن وە حەزرەتی عەبباس وە علی کوری حوسەینو ٠ موحەممەدی کوری عەلی وەجەعفەری کوری موحەممەد وە حەزرەتی صەفیەی پوری پیغەمبەر ( درووی خوای لە سەر بیت چونکو حەدیس زۆر هەنە لە باسی خێری زیارەتی بەقیع وە قەبرەکانی ٠

چوارەم : ئەفەرمویت باش وایە زیارەتی قەبری شەهیدانی چیای ئوحد بکەیت وە لە رۆژی پێنجشەم باشترە بە تایبەتی قەبری حەزرەتی حەمزە وە لە بەیانیدا بروات تاکو بگاتەوە جەماعەتی نیوەرۆ لە مزگەوتی حەزرەت ( د ) ٠

پێنجەم : ئەفرمویت زۆر باشە کە بچیتە مزگەوتی قوبا وە لە رۆژی شەمودا باشترە ٠ وە نیەتی خێرو نوێژ کردن بیت لەوێدا چونکو ترمذی ئەفەرمویت کە پێغەمبەر (د) فەرمویەتی نوێژێك لە مزگەوتی قوبا خێری عومرەکی هەیە وە لە موسلمو بوخاریدا ئەلێت کە پێغەمبەر (د) هەمو شەموێك ئەچو بۆ مزگەوتی قوبا ٠ وە باش وایە لە ئاوی بیری ئەریس بخواتەوە وە دەست نوێژی لێ بشوات ٠

شەشەم : باش وایە بچیتە ئەو بیرانەی کە حەزرەت خۆی لێ شوشتینە وە دەست نوێژی لێ هەلگرتونە وە بچیت دەست نوێژیان لێ هەلگری وە ئاویان لێ بخواتەوە ٠

حەوتەم : باش وایە کە ویستی بگەرێتەوە ماڵئاوایی لە مز گەوتی حەزرەت بکات بە دوو رەکعەت نوێژ وە لە خوا بپارێتەوە وە زیارەتی قەبری حەزرەتیش بکات وە دوعایەکەی رابردو بکات وە بڵێت خوایە نەیکەی بە دوا جار لە زیارەتی حەرەمی حەزرەت‌و مزگەوت‌و قەبری پیروزی‌و بۆم رێکخەی بگە رێمەوە بۆ هەردو حەرەم‌و خۆشی‌و سەلامەتی دین‌و دونیام پێ ببەخشە وە بمانگێریەوە بە سەلامەتی‌و قازانج پێ دراو وە راستەو راست ئەکشێتەوە نەك پشتاو پشت •

جا ئەوەندە بۆ کە خوا بۆی رێك خستم بۆ کوکردنەوەو نوسین لە باسی حەج وە لە خوام داوایە موسلمانان سودی لێ وەربگرن وە خوا سودیش بە من ببەخشیت بە لێ خوشبون لە گوناهم وەپارێزتنم لە هەمو بەلائێك چونکو بەس ئەوە پەناهم لە هەر دو ژیان دا •

« تێ بینی »

ئەو دوعایانەی کە هەنە بۆ حاجیان بەپێ جێگەو زیارەتگایەکان زۆرن • وە من نەم نوسین چونکو درێژەی زۆر ئەویست وە باشتر دوعا ئەوەیە کە مرۆ بە زوبانی خۆی چێ ئەوێت لە خوا داوا بکات لە هەمو جێگەیێك • وە لە هەمو دوعا باشتر ئەمەیە بۆ هەمو جێگە کە بلێ ( ربّنا آتنا فی الدنیا حسنة وفی الاخرة حسنة وقنا عذاب النار ) آمین جا ئەو دوعایە خوا دایناوە وە ماناى بزانە وە لە هەمو جێگە دا زۆری بلێ وە بیخوێنەوە لە هەموشت باشترە بۆ دونیاو قیامەت وە بۆ سەرەتای هەمو ئیشبك‌و کوتایی •

# سەرچاوەکانی نامە


١ ـ القرآن الكريم
٢ ـ تاج الأصول في أحاديث الرسول صلى الله تعالى عليه وآله وسلم
٣ ـ ابن العابدين في الفقه الحنفي
٤ ـ تبيين الحقائق للعلامه فخرالدين عثمان بن علي الزيلعي I الفقه الحنفي
٥ ـ بدائع الصنائع للعلامة علاءالدين أبى بكر بن مسعود الكاساني I الفقه الحنفـــي
٦ ـ حاشية الدسوقي على الشرح الكبير للعلامة الشيخ عرفة الدســوقي في الفقــه المالكــي
٧ ـ بغية الطالب النبيل نظم مختصر سيدى خليل للشيخ عبدالعزيز العلمجه في الفقه المالكي
٨ ـ حاشية الجمل على شرح المنهج للشيخ سليمان الكردي المشهور بجمل ٠ في الفقه الشافعي
٩ ـ مغنى المحتاج على المنهاج للخطيب الشربيني في الفقه الشافعي ٠
١٠ـ حاشية الشيخ ابن حجر الهيثمي على الايضاح للامــام النــووى ٠ في الفقه الشــافعي ٠
١١ـ المهذب لابن اسحاق الشيرازي في الفقه الشافعي
١٢ـ معنى ابن قدامة المقدسي في الفقه الحنبلي
١٣ـ محلى لابن حزم الاندلسي الطاهري
١٤ـ الحج والعمره لعبرالرحمن الدمشقي
١٥ـ الميزان الكبرى للشعرانى
١٦ـ توضيح المناسك للسيد أحمد عبدالقادر خطيب المسجد الحنفي بجده
١٧ـ دليل الحج للمطوف محمد صالح جمال من اهل مكة المكرمة
١٨ـ كتاب على المذاهب الاربعة لعبدالرحمن الجزري
١٩ـ ارشاد السالك لاداء المناسك للشيخ عبدالكريم المدرس في حضرة الشيخ عبدالقادر الكيلاني ٠
٢٠ـ چراىڕو ناكى لمحمد طه الباليسـانى
٢١ـ مختار الصحاح اللغة
٢٢ـ كيف تحج وكيف تعتمر لمحمد طــه الباليسانى

ناوەرۆکی‌نامە ( فهرست )


| لاپەرە | بابەت |
|---|---|
| ٢ | دیباجـــة |
| ٥ | ئاگادارکردن لە چۆنیەتی نووسینی‌نامــە |
| ٦ | باسی یەکەم حەج واجبە وەلەسەر کێ واجبە وبە چ مەرجێك واجبە ٠ |
| ٧ | باسی پەككەوتو لە کردنی حەج ٠ |
| ٨ | کە حەج واجب ئەبێ گورج بیکەی یا نە، |
| ٩ | باسی دووەم لە واتای چەند ووشەیێك کە لە باسی دێنەپێش ٠ |
| ١١ | باسی میقاتی ( کاتی )زەمانی وەمکانی لە چەند پەلدا |
| ١٢ | پەلی یەکەم میقاتی خەلکی مەککەو خەلکی وولآتان ٠ |
| ١٥ | پەلی دووەم دروستە پێش میقات ئیحرام ببەستی یا نە ٠ |
| ١٥ | پەلی سێیەم دروســتە کــە گەیشتیــە میقــات ئیحــرام دووابخــەی بۆ میقاتێکی تر یا نەنا ٠ |
| ١٦ | پەلی چوررەم حوکمی ئەوەی کە بە بێ ئیحرام لە میقات تێ‌ئەپەرێت ٠ |
| ١٧ | پوختەی قسە لە باسی تێپەربوون لە میقات ٠ |
| ١٩ | باسی میقاتی ئەو کەس کە بە فرۆکە ئەچیت بۆ حەج ٠ |
| ٢٠ | باسی ئەو ەکە بە سێ جۆر ئیحرام لە میقات‌دا ئەبەسترێت ٠ |
| ٢١ | باسی چۆنیەتی حەجی تەنها ٠ |
| ٢٣ | باسی حەجی بە تەمەتتوع ( تمتع ) ٠ |
| ٢٤ | باسی چۆنیەتی حەج بە لێکدان واتە حەج‌و عومرە پێکەوە ٠ |
| ٢٩ | باسی فیدیە لە حەجی تەمەتتوع وەحەجی‌لێکـدانەوە جێکـە بە جــێ هینانی وە دروستە خۆت لێ‌ی‌بخۆیت یانەئا ٠ |

| لاپەرە | بابەت |
|---|---|
| ٣٣ | باسی کردەوەکانی حەج و حوکمیان لە هەر مەزهەبێك . |
| ٣٥ | باسی کردەوەی یەکەم خۆپاك کردن . |
| ٣٥ | باسی کردەوەی دووەم خۆشوشتن . |
| ٣٥ | باسی کردەوەی سێیەم خۆبۆن خۆش کردن . |
| ٣٦ | کردەوەی چوارەم پەشتەماڵ لە خۆ لوولدان . |
| ٣٦ | کردەوەی پێنجەم دوو رەکعەتی ئیحرام . |
| ٣٧ | کردەوەی شەشەم ئیحرام بەستن . وەئەو شتانەی بە ئیحرام لە مرۆ قەدەغەئەبن . |
| ٤٣ | باسی سزای ئەو کەسە کەشتێك لەو قەدەغەکراوانە ئەکات . |
| ٤٦ | حوکمی ئەو کەسەی کە لە کاتی ئیحرام ئەمە لەگەڵ ژنئەکات . |
| ٤٨ | باسی نێچیرگرتن و داروگیابڕین لە حەرەمی مەککە وەحوکمی باقی قەدەغەکراوەکانی تر . |
| ٥١ | باسی فیدیەی لە بری قەدەغەکراوەکانەوە جێگەی بە جێ هێنانی . |
| ٥٢ | باسی کردەوەی حەوتەم کە ووتنی ( لبیك ) یە |
| ٥٣ | باسی کردەوەی هەشتەم تەوافی گەیشتنە مەککەی پیرۆزو مەرجەکانی دروستبوونی تەواف . |
| ٥٨ | باسی چارەی ژنیحە یزداریان منداڵبووی بۆ تەواف |
| ٥٩ | باسی کردەوەی دەیەم دوو رەکعەتی پاشی تەوان |
| ٦٠ | باسیکردەوەی یازدەم سەعیلە بەینی سەفارمەروە |
| ٦٢ | جەدوەلێك لە باسی چەند شتێك لە تەواف و سەعیدا |
| ٦٣ | تێبینی لە باسی نەکردنی واجب یان فەرز یان سوننەت و سزایان . |
| ٦٤ | کردەوەی دووازدەم شەوی عالفە لە میناخەوتن . |
| ٦٤ | حوکمی کردەوەی سیزدەم ویستان لە عارەفات . |
| ٦٥ | حوکمی ئەو کەسەی کە ویستانی عارەفاتی بۆ نەکرا یان نەیکرد |

| لاپــەرە | بابــەت |
|---|---|
| ٦٧ | حوكمی كردەوەی چواردەمو پازدەمو شازدەم ٠ |
| ٦٨ | باس كردەوەی هەڤدەم رەجمی كۆسپەی گەورە ٠ |
| ٧٠ | باسی كردەوەی هەژدەمو نۆزدەم واتە سەربرینو سەرتاشین ٠ |
| ٧١ | باسی كردەوەی بیستەم تەوافی ئیفاضە ٠ |
| ٧٢ | باسی هەردوو ( تحلل ) دەرچوون لە ئیحرام ٠ |
| ٧٤ | كردەوەی بیستو یەكەم مانەوە لە مینا پاش جێژنە ٠ |
| ٧٦ | كردەوەی بیستو دووەم رەجمكردن لە سێ رۆژەكانی پاش جێژنە ٠ |
| ٧٨ | كردەوەی بیستو سێیەم تەوافی دەرچوون لە مەككەی پیرۆز ٠ |
| ٨٠ | جەدوەلێك لە باسی حوكمی ئەو كردەوانە بە پێی پێنج رێباز (مذهب) |
| ٨٠ | سزای نەكردنی ئەم كردەوانە ٠ |
| ٨٢ | باسی عومرەو كردەوەكانی ٠ |
| ٨٣ | باسی چوونی مەدینەی پیرۆز |
| ٨٦ | باسی دوعاكانی كە لە حەج ئەخوێندرێن ٠ |
| ٨٩ | سەرچاوەكــانی نامــــە ٠ |
| ٩٠ | نــاوەرۆك ( فهرســــت ) |

